زنجیرەی كتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
كتێبی سەردەم ژمارە ( 205 )

سەرپەرشتیاری گشتی

ئازاد بەرزنجی

ناوی كتێب: هەوڵێك بۆ كوشتنی كات
ناوی نووسەر: دڵشاد عەبدوڵڵا
بابەت: شیعر
مۆنتاژی كۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
تیراژ: 400 دانە
ژمارەی سپاردن :509 ی 2002
www.sardam.net

## لە جیاتی پێشەکی:

### مێژووی زەریا لە زاکیرەی قەترەیەکدا

کە دەستم بە نووسین کرد، ئێسك و پرووسکی بەشەری بەر لە پەنجا هەزار ساڵ لە شانەدەر دۆزرابووەوە، ئەو دەنکە گەنم و جۆیانەی جوتیارانی زاوی چەمێ لە ڕۆخ ڕووباری زابی گەورە چاندبوویان هەراش ببوون، لە گردی قالینج ئاغاوە تا شەڕی تەروادە هەمین و هێلین-مان لێ بزر ببوون، لە پەرستگای عەشتارەوە (کە تەنیا وەهمەکانی مابوونەوە لە شاردا) تا ئەکباتان، سوپایەکی خەیاڵی هەڵیاندابوو، شیر و تیریان لە یەکتری دەسووی، باقوبریق و جقەی شەهێنی هەورامانی سەرتیرەکانیان لە ڕۆژە ڕێیەکەوە دیاربوو، سەری ڕمەکانیان شتێکی وەکو ئەستێرەی لەسەر دەبریسکایەوە، بێ ئەوەی لە شەڕێکدا براوەبووبن.

ئیمارەتەکان کەوتبوون بەسەر خانی و نالی و مەولەویدا، خۆرهەلات کەوتبوو بەسەر گاتاکاندا، قەدەغە بوو لە کونی ڕۆحەوە سەرکەوی بۆ سەری سەرەوەی ئۆڵمپ و یاری خواوەندەکان ببینی بە نوێژی نیوەڕۆ.

كە دەستم پێكرد، باسی لەش و حەرامەكانی قەدەغە بوو، خەوبینین بەو حەرامەوە بڤە بوو، شانە بە شانە بە نهێنی هاتم تا شیعر لە پەنجەكاندا ڕژا، لەو شوێنە ناسك و هەستدارانەدا هاتمە ناوەوە. دۆزینەوەی ئەو ڕێچكە شیرییە كاریگەرییەكی زۆری كردە سەر شەفافییەتی زمان و ڕستەی شیعریی و جیهانبینیم، لە قەسیدەی (سووتانی ڕەنگەكان)دا دەستم بۆ ئەو ناوچە حەرامانە درێژ كردووە. ئەو قەسیدەیە كە لە قەسیدەكانی بەرایمەو لەناو برادەرەكانم بەو شیعرە ناسرام.

دین بە ناهەق ڕۆح و لەشی لەیەكتر جیاكردبووەوە، دواتر دركم بەوە كرد كە لەش ڕۆحە لە شێوەی نوور و ڕۆح لەشە لە شێوەی ئاودا. جارێكیان تازە فامم دەكرد، پێستیژن و سێوم لێك جیانەدەكردەوە، لە درزی عەباوە لەش و لاری ژنێكم دی لە دەرگای گەورەی قەڵاتێ دەهاتە دەرێ، خەتێكی سپی هێندەی دەركەوتنی ڕووناكی چرایەكی كز دیاركەوت لای من پرشنگی دا و ناوەوەمی كردە چراخان، ئەوە یەكەم جارم بوو لەشی ژنێك ببینم لە لەشی دایكم نەچێ، وام مەزەندە دەكرد، ڕێك لەو شوێنەدا ئەسكەندەری مەكدۆنی داریوشی شكاندووە، یا عەشتار یەكەم جار بەسەر پشتی هەورێكەوە لەوێ دابەزیووە. قەڵات هەر هێندەی پێ نەبەخشیووم، ئەو كتێكە هەموو ڕۆژی بەشێكیم خوێندۆتەوە و هەر جارەی تامێكی پێ داوم، پێشانگەیەك بوو هەر ڕۆژە تابلۆكانی نوێ دەبوونەوە، هەندێ جار وا دەهاتە بەرچاو كە خۆرێكە مانگ و ئەستێرەكان بە دەوریدا دەخولێنەوە بۆ ئەوەی سوننەتی ژیان جێبەجێ بكرێ و گەردوون لە گرێژنە دەرنەچێ.

برادەرەکانم لە یۆنانەوە دەهاتن بلوزی فەلسەفەیان بۆ دەهێنایین تا سەرمای زستان ئێسقانمان تووشی ئەنفلەوەنزە نەکات، لە ڕۆماوە دەهاتن و سروودەکانی کۆمیدیای دانتیمان بە ئاواز دەخوێندەوە تا فێری عیبادەتی مەعنا بین، لە دەریاوە بە سەرپشتی قەسیدەکانی سان جۆن پێرسەوە دەهاتن و فێری ڕستەی هەناسەدرێژی با، فێری وشەی ئیسفەنجییان دەکردین. مەنتیقی شیعر لە ڕستە کۆنکرێتیە چەند ڕەگەکانی ئیلیۆتەوە فێر دەبووین، مۆبی دیك و مادام بۆفاری و برایانی کارامازۆف و چی و چیمان دەخوێندەوە بۆ راوی مانای سرك، کە تەواو شەکەت دەبووین شەوە ساردەکان بەسەر پشتی بەلەمەیەکی سەرخۆشی ڕامبۆ دەماینەوە، گوڵە بەدەکانلە خشتەیان دەبردین و دەیانبردین بۆ هەتاهەتاکانی ڕۆحی لە بن نەهاتووی لە شەوی هەزارویەکدا.

لە مەم و زینی خانی زۆر شت فێربووم، یەکەم جار بوو لە زمانی کوردیدا قەسیدەی چەند ڕەگەز و چەند ڕەگ بخوێنمەوە، ڕستەیەك کە ڕستەی تر لەپاڵ خۆیدا بشارێتەوە، وشەیەك مانای تری قووت دابێ لە هەناوی خۆیدا، ئەو جۆرە قەسیدە ئاوێتەیە فرە توانای خانی دەردەخا.

هەمیشە ئەحمەدی خانیم لەو وێنەی (باباجان) دروستی کردبوو جوانتر دەهاتە بەر دیدە، وام مەزەندە دەکرد کە ئەو هونەرمەندە جوان لە سیما و ڕۆحی خانی ورد نەبۆتەوە، هەر لەوجۆرە ڕامانەوە جارێکی تر چوومەوە سەر وێنەی مەسیح و دڵنیابووم ئەو مەسیحەی ئێستا دەیبینین سیمای هەمان ئەو مەسیحە نییە کە هەبووە، ئەوە خواستی

ئەوروپاییيانە بۆ یەسوع، ڕەنگە مەسیح ئەسمەرێكی باڵابەرزی چاو و برۆ ڕەشی ڕۆژهەڵاتی بووبێ، كێ ناڵێ؟

ئەوكاتەی دەمووویست ڕستەیەكی شیعریی بنووسم، لە نزیك حەمامی جووت گومبەت و لای منارەی خانەقا كە حاجی لەقلەقەكەی بەسەرەوە بوو، ئەو تەیرە لە شەڕی ناوخۆی دوا ڕۆژەكانی سەدەی بیستەمدا هێلانەی بە یەكجاری تێكدرا، لەوێ تووشی سەلاحەدینی ئەیووبی هاتم، بەڵام چ تووش بوونێك؟ ئەو پرسیاری نەدەكرد، تەنیا گوێی بۆ قسەكانی من هەڵخستبوو، منیش چیم لە دڵدا بوو هەڵمڕشت، پێموت، جەبەرووتی هێز و بێ جەدواییەكەی، هەردووكی لە تۆدا دەبینم، من (پاڵەوانەكان)ی كارلایلم خوێندبووەوە، بۆیە دەموت هێز پێویستی بە نوێ بوونەوە هەیە، هەر نەوەیەك و خەونی خۆی لە جۆرە هێزێكدا بەرجەستە دەكات، هەموو جارێ هەر بازوو بە تەنیا شت نییە، ئەفراندن هێزێكی لە بن نەهاتووە لە هەناوی بەشەریەتدا، كە هەڵیكرد هیچ بەربەستێك نایگێڕێتەوە، دەمزانی ئەو دەسەڵاتدارە حەكیمە گوێم لێ دەگرێ، ئەو لە خۆنەویستیدا ڕەمزێكی گەورەیە، بۆیە كە پێموت، تۆ وەكو كابووسێكی گەورەی شارەكەمی! بزەیەكی هاتێ، ئەوە جاری یەكەم بوو وێنەی سەلاحەدینی ئەیوبی ببینم لەسەر كاغەزێكدا، سەرەتا كاغەزەكەم هەڵگرتەوە نەمزانی وێنەی كێیە، وتم ڕەنگە سوڵتانێك بێ لە سوڵتانەكانی عوسمانلی، یا شایەك بێ لە شاكانی ئێران، چونكە هەر ئەوان بەو چەشنە جلوبەرگ و هەیبەتەوە وێنەیان لە كتێب و

گۆڤاراندا بڵاودەکرایەوە، یەکەم جار بوو میرێکی گەورەی کورد ببینم بەو شێوەیە، میرێك کە کەم میری ڕۆژهەڵات شانی داوە لە شانی.

من بۆ خۆم، ناشیرینترین وێنە بەڵام ئەوەیە کە بە تفەنگێکی بڕنەو و دەمانچەیەکەوە گرتوومە، ئەو کات مفاوەزاتی کورد و حکوومەتی عارف بوو، تەمەنم لە دەوری یازدە و دوانزە ساڵاندا بوو. کوڕە گەورەی ماڵەوە بووم. دایکم حەزی دەکرد وێنەیەکم هەبێ لە خۆم گەورەتر دیار بم، باوکم زۆری حەز دەکرد، دیمەنم لە پیاو بچێ! جلی کوردیان لەبەر کردم و لەگەڵ خاڵەکەم کە تازە گەڕابووەوە شار ناردمیانە ستۆدیۆ (یاسین) –ئەو کات لەسەری گەڕەکەکەمان بوو– لەوێ بڕنەوەکەیان خستە کۆشم کە بە قەدەر باڵام دەبوو. دەمانچەیان بۆ بەستم.. هتد. هەرجارەی سەیری ئەو وێنەیە دەکەم ئەو غەدرە گەورەیە پەستم دەکات کە لە منداڵی کورد کراوە؛ کە بۆتە قوربانی غەریزەی گەورەکان. ئەو کاریکاتێرە زۆر جوان تەعبیر لەو موعاناتە دەکا، کە منداڵێك سواری ئەسپێکی یاری بووە و لە دنیا بچکۆلەکەی خۆیدا نقووم بووە، کەچی لە سەرەوە گەورەکان شەڕدەکەن و شمشێرەکانیان بەریەکتری دەکەون و لە کاتی تلبوونەوەیاندا شمشێرەکان لە دەستی قوربانییەکان دەکەونە خوارەوەو هەڕەشە لە دنیای منداڵەکە دەکەن و ڕێك بۆ لای تەوقی سەری ئەوان شۆڕ دەبنەوە.

شوکر کە گەورە بووم نەبوومە (پیاو)ی ناو وێنەکە و ئێستاش چەشنی منداڵی ناو کاریکاتێرەکە شمشێری شەڕەکان لە سەرەوە هەڕەشەم لێدەکەن!

وێنەكان كەڵەكەبوون، ڕەش و سپی. ڕەنگاوڕەنگ.. جاریێ لە شوێنی گشتی و جارێكی دی لە شوێنی كاركردن، لە باخچەی گشتی لە هۆڵی ئاهەنگ، قۆڵ لە قۆڵی ژن، لەگەڵ منداڵەكاندا.. تەمی تەنكی خەمێكی شینی كاڵ نیشتۆتە سەر سیمام.. بەو تەمە دەناسرێمەوە. دەڵێن چاو پەنجەرەی ڕۆحە، منیش ئەو تاریك و ڕوونە لەو پەنجەرەیەوە دەبینم. كەچی جوانترین وێنە ئەوانەن كە خۆم گرتوومن و دیمەنی شتەكانن، وەلێ خۆم تێدا شاردۆتەوە! ئەو وێنانە ڕێك هاوكێشە بابەتییەكەی ئەلیۆتن وەكو ئەو شیعرانە وان كە زەمیری ئاخاوتن -م- نییە. لەو جۆرە وێنانەدا خۆم دەبینم بە دوای سەرابدا ڕادەكەم، سەرابێك كە هەمیشە سیحری بەردەوام بوونم پێ دەبەخشێ.

وێنەكان ئاوێنەیەكی تەڵخی تەمەنن، ئەگینا كوا من لەناو باخچەیەكی بەهاریدا وەستاوم و لە جوڵە كەوتووم، باخچە و ئاسمانی سەرووی، خەونەكانی ئومێد و وەفا، ئازار و تلانەوە، لە یەك جیابوونەوە و سووتان.. هتد، ئەو هەموو ئاڵۆزییە چۆن لە فۆتۆگرافدا مت بوون؟ ژۆكەندە ئەو كەسە نییە كە هەبووە، ئەو كەسەیە كە دافنشیخەونی پێوە بینیووە و ئەو خەوانەی لە سیحری زەردەخەدا بەرجەستە كردووە.

كە كامێرا لێم نزیك دەبێتەوەە، لە بوون دادەبڕێم، بۆ ساتێك لە سیاقی بزووتنەوەو ژیان دێمە دەرەوە، دەپرسم ئەو جاسووسە دیسان هاتو ڕاپۆرتێكی پڕ لە هەڵەی نووسیو لەناو ڕەفەی تەمەنی دانا، ئەگینا من لەسەر كورسییەكە دانەنیشتووم، لە پەنجەرەكەوە سەیری كامێرا ئەكەم، من چاوم لەوێیە و چەند ساتێكی دی كورسییەكە جێ دێڵم و دەچمە ئەوێ،

ئەوێ کە منداڵیمی لێیە، من بۆ لای منداڵی ڕادەکەم و وێنەکان بۆ لای مردنم دەبەن! ئەو جاسووسەی باسی ئەوێ ناکات. عەیب و عارەکانم دەرناخا، ناڕێکی شتەکان دەشارێتەوە بۆ ئەوەی من هەڵخەڵەتێنێ و چەشنی (نەرسیس) خۆم هەڵدەمە ناو ئاوەکانی عەدەم، کەچی ئەسڵەن جوانییەکان پێکەوە نەبن لای من مانایەکی ئەوتۆ نابەخشن.

شوێن هەرگیز پشتگوێ ناخرێ، لە بستە خاکێکدا لەدایک دەبین بەڵام لە گەردووندا دەژین، کەس نەیویستووە بچێتە پشت گەردوون لەوێ گوڵەکانی ئاگر بۆن بکا و بای ناو بۆشایی پرچی بێنێتە نێو چاوانییەوە، ئەگەر شاعیرێك ویستبێتی بەو ئاراستەیەدا بفڕێ، وتوویانە: الشعراو یتبعهم الغاوون.. یا لە کۆمارەکان دەریان پەڕاندوون، گۆیە ئەوان دەبنە سەرچاوەی سەرکێشی و یاخیبوون.. جا چ قەیدی؟ با دەسەڵاتێك لەو دەسەڵاتانەی زەوی بە ئەمری شاعیرێك سەرەنگوون بێ، خۆ هەر دەسەڵاتێك کە هاتووە دەسەڵاتێکی پێش خۆی تەفرووتوون کردووە ئەوجا هاتۆتە سەر تەختی.

جوانی هەمیشە مەنتیقی جوانی بە هێز دەکا و تێکی نادا، لە شوێنێکدا نووسیومە (گەردوونی من نالّپارێزە)، بە قسەی من گەردوونی خەڵکی تر ڕەش ناکرێتەوە، هەریەکەو خەون بەو گەردوونەوە دەبینێ کە منداڵی ئەوی لێیە. من تا ساڵی نەوەدوییەك و تا کۆڕەوەکە نالّپارێزم نەدیبوو، بەڵام لەوێ هەموو شتێکم لە یەکەم بینیندا لێ بزر بوو، نەمدەزانی کامە لای ڕاستی دنیایە و کامە لای چەپیەتی، سەروو ژێریم تەواو لێ تێکەڵ ببوو. درەختەکانی نالّپارێز سەرووی خۆیان نیشاندام، خانووە ڕووخاوەکانی، ژێری

خۆیـــان نیشـــان دام، بـــەیانی ئـــەوێ ڕۆژهـــەڵاتی پـــێ ناســـاندم و دۆزەخێـــك كـــە بـە چـاوی خـۆم دیـم خۆرئـاوای بـوو، خۆرئاوایـەك كـە خـۆری تێـدا ئـاوا نـەبوو، بـەڵكو خۆری تێدا كوژرا!

لەوێ هیچ شتێك لە دۆخی خۆیدا نەبوو، لە نێوان ژیان و مردندا، نـاندین پڕببـوو لـە ئاوێك نەمدەزانی ئەو ئاوە لـە كـوێ هـاتووە، ئـاو لـە جلوبەرگـەوە هـاتبووە ژوورێ، پێـڵاو پڕبوو لە ئاو، قژ ئـاوی لێ دەتكـا، دەمـار پڕبـوو لـە ئـاو، ئـاو و ئـاو و ئـاو، هـەموو شـتێك چووبـووە نـاو لافـاوێكی ترسـناكەوە، منیـش بەسـەر كەشـتییەكی بچوكـەوە ئەگـەر نـزاو پاڕانەوەی بێگوناهان نەبووایە باران لێی نەدەكردەوە و میللەتێك ئاو دەیبرد.

من و ئاو هیچ شتێكمان لە بەیندا نەمابوو، لەوێ لافاوی ڕۆژانی منداڵیم دەهاتەوە یاد، ئەو ساتانەی باران ماڵ و گەڕەكی پڕ دەكرد لە تووڕەبوونی خۆی.

تۆفانی من ئەم شەوە بوو لە ناڵپارێز، تۆفانی من ئەو شەوە بوو لە منداڵیدا.

جێگا پڕە لە نهێنی، خۆشبەحاڵی ئەو كەسانەی دەتوانن چنگێك لەو نهێنییە هەڵگرن و ببیەن لەگەڵ خۆیاندا، تا دنیا دنیایە فڕێی نەدەن.

خوا هەمەدانی بۆ بابا تاهیر دروستكرد، ناڵپارێزی بۆ غـەریبی مـن. ئێستا تەمەن چەند پێچێك بە دەوری خـۆی سـووڕاوەتەوە، هێشـتا حوسـنی جێگـا هـەر ئەفسـانەیە، تەلیسـمە بـەتاڵ نەبۆتـەوە، بـە تایبـەتی لای مـن كـە لـە نێـوان چوونـە دەر و گەڕانـەوە بـۆ منداڵـی پرسیارێكی بێ ئامان بێ وەڵام ماوەتەوە .

نهێنی یەکەم دڵۆپ هەرگیز خۆی نادا بە دەستەوە، سروشت جوانیخۆی لە وەرزەکاندا دووبارە ناکاتەوە بەڵکو خۆی دروست دەکاتەوە بە جوانی وەرزەکان.

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی هەردووکیان، هەردووکیان بە وشە دەست پێدەکەن و لەوێوە ڕووباری ڕستە دەڕژێن و بەفری پەرەگراف لوتکە سپی دەکەن و بای کتێب تێکەڵی تووڕەبوونی دارستان دەبن، بەو چەشنە شیعر و ئاین، سیحر و سروشت ئاوێتە دەبن لە ڕۆحی ماندوودا.

یەکەم سروشت بەهەشت بوو، کەس نەیدی جگە لە ئادەم و حەوا، ئەوان هاتن حیکایەتی جوانییەکانی ئەوێیان بۆ گێڕاینەوە، خەونیان پڕکردین لە سیحری ئەوێ، زمانیان قفڵ داین بە نهێنی ئەوێ، چاویان پڕکردین لە فرمێسکی ئەوێ، نە ئەوان پێی گەیشتنەوە نە ئێمەیان بە جوانی ئەوێ فرچك دا.. بەو شێوەیە لە یەکەم سروشت جیاکراینەوە، لەوساوە تەنیا مافی ئەوەمان هەبووە کە خەونی پێوە ببینین، ئیتر لەوێوە گوناح هاتە ناوەوە، گوناحی دروستکردنی بەهەشتێکی ونبوو، یا گواستنەوەی سوچێکی، دیمەنێکی و سەرلەنوێ دارشتنەوەی بە هەست و عەقڵێکی مرۆیانەوە.

بەو چەشنە یەکەم سروشت لەناو تەمی سەردەمەکاندا بزر بوو، ئەوانەی چاوی دڵیان تیژە تەماشایان کردووە، تخوبەکانیان ناسیوەتەوە، بە جوانی پڕ لە ئیلهامی ئەوێدا هەڵیانداوە، ئەو هەموو خاسیەتەی ئەوێ تووشی دڵەڕاکێی کردووین لە بەرامبەر سروشتی دووەمدا.

ڕووبارەكـانی ئـێرە و هەنگوینــە ڕووبارەكـانی ئـەوێ، درەختــە زســتانییەكانی ئـێرە و هەمیشە كەسكەكانی ئەوێ.. تاد، بەو شێوەیە سروشتی دووەم تووشـی جۆرە ئیحراجییـەك بـووە، شـاعیران هـاتوون مـەعنا و دەلالـەتی نـوێ و بـەرزیان بـە بـاڵای سروشــتدا بڕیــووە، كردوویانە بە شاجوانی گەردوون.

دۆزینـــەوەی جوانــــی لـــە سروشــــتدا خۆمـــاندووكردنێكی زۆری نـــاوێ، بــــەڵام دۆزینــەوەی مــەعنا و مــەغزا و حیكمەتــەكانی، تەمــەنێكی پــڕ لــە ئــازار و هیلاكــی و ڕامانی دەوێ.

سروشت یەكەم هێزە لانكی بوونی هەژاندووە، سنگی پڕ گەوهـەری خـۆی كردۆتـەوە بـۆ شـڵەژاندن و دڵنیاكردنـەوەی ئـەو شـڵەژاندن و دڵنیاكردنەوەیـە بۆتـە مایـەی دروسـتكردنی ئەو هەموو خواوەنـدە بـۆ سروشـت تـا لـە ڕێـی پەرستنیان هێزی شڵەژاندن كپ بكرێتـەوە و بەخشندەیی و دڵنیاكردنەوەی پەرە پێبدرێ.

ئایندەی سروشت دیار نییە وەكو چۆن ڕابردووشـی ئاڵۆزە و نادیـار، تەماشـای بـەردێك بكـە، نـازانی چـۆن هـاتووە و تاكـەی دەمێنێتـەوە، كـە ڕۆی ڕوو لـە كـوێ دەكـات، لـە هێڵـی ناخی وردبەوە، هەر پێچێكی هی تەمەنێك و هی وەرزێك و ڕۆژگارێكە.

هەریەكەمان لـەتێكی سروشت دەبینێـت و ئیلـهام لـەو لەتـە وەردەگریـن، مـافی بینینـی هەموو سروشت مرۆ لە خۆی سەندۆتەوە و بە خواوەندی ڕەوا بینیوە.

سێ بەشی سروشتی وڵاتم چیایە، گۆیە چیانشین چڕتر دەبینین، چیا خەست بۆتەوە

لە شوێندا. کە یفم نەهاتووە کە ڕوانینم زێدە ڕۆیشتووە، ویستوومە چڕتر ببینم چەشنی شاخنشین چڕ بێ زمانی چڕینم.

هەمیشە قاچەکانم لەوسەری ئەو لێفە شینە هاتوونەتە دەرێ کە پێیان داداوم، ئەوە حیکمەتی مانەوەمە.

ناخی سروشت چەشنی بورکان پڕە لە هێزی زەبەللاح، لە شیعری کوردیدا ئەو هێزانە پشتگوێ خراون، سروشتێکی بێ جوڵە و بێ زمان دەبینی لەناو وێنەی چوارچێوەداردا، من لەلای مەولەوی دەرچوونم دیووە لەو چوارچێوەیە بە ئاراستەی تێکەڵاوکردنی هەستو سروشت یا بە شێوەیەکی تر، سروشت بۆتە تەرمۆمەتری ناخی ئەو لە هەڵکشانو داکشانیدا، وەکی دی کەمتر دەست بۆ هێزی سەرکێش و لەبن نەهاتووی سروشت براوە. ئەو سروشتەی هەست بە ئازار دەکا وەکو چۆن هەست بە کەیف و خۆشی دەکا. گوێ لە چڵێکی بگرە، لە تافی لاویدا بسووتێ چیدەکا، چۆن دەفیشکێنێو بە زەحمەت دەسووتێ، هەمان چڵ کە وشك دەبێ چۆن لە کاتێکی کورتدا دەبێتە خۆڵەمێش و کلوکلۆی دادەمرکێ؟

ئینجا هەنسکی ساردی ژنان و شەونمی سەرگەڵا بەراورد بکە، گیای دەوری کانی و نازانم کوێ و کوێ لەش بەراوردبکە، ئەو هەموو شتانە هەموویان هەستدارن، من زۆرجاران خۆم بە دارهەناری حەوشەکەمان دەچووێنم، ئەویش وەکو من کوڕی گەورەی ماڵەو هێشتا سەری نەڕووتاوەتەوەو هەردووکمان لە دواڕۆژانی بەهاری تەمەنداین، ئەو بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستێ و ملی لەسەر دیوار درێژ دەکا بۆ ئەوەی هەوای پاك هەڵمژێ

و تیشكی هەتاوی لێ بدا و هەناری خۆشتر بگرێ.

شیعری كوردی لە سەرەتاوە بە دوو ئاراستەدا هاتووە، یەكیان شیعری كردۆتە ئامراز بۆ مەبەستی سیاسی و كۆمەڵایەتی، لای ئەوی دی شیعر ئامانجە وەكو هونەر و جوانی. هەریەك لەو دوو ئاراستەیە شاعیری خۆیان هەبووە لە پلەوپایەی دەربڕینی جیاوازدا. من ئاراستەی دووەم بە مێژووی ئەفراندنی خۆم دەزانم. دیارە ئەو جۆرە دابەشكردنە گشتییە و لە خوار ئەو دابەشكردنەوە ئەزموونی جیاواز هەن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە شتێك دەمێنێتەوە لەهەر ئەزموونێكدا ئەویش شیعریەتە كە تاكە پێوانەیە بۆ هەموو بەرهەمێكی شیعریی و پردی هاوبەشە لە نێوان ئەزموونە زیندووەكاندا.

لە شیعردا زمان بایەخێكی بنەڕەتی هەیە، زمانی نوێی ئەدەبی كوردی لەگەڵ پەرەسەندنی بیری نەتەوایەتی سەربەخۆ خوازدا دەستی پێكردووە، سەرەتا بە پاككردنەوەی زمان لە وشەی بێگانە دەستی پێكرد و پاشان چووە ناو ڕستەسازی و گرامەرەوە.

ئەو نوێ بوونەوەیە لە سەردەمی تازەدا لەسەر دەستی دەستەی یەكەمی شاعیرانی نوێخواز (گۆران و برادەرەكانی) دەستی پێكرد و ڕزگار بوو لە زمانی حوجرە و كۆت و بەندەكانی، دواتر لە حەفتاكاندا ڕوانگە (شێركۆ بێكەس و برادەرەكانی) ڕستەیەكی شیعریی جیاوازیان خوڵقاند، كە لە زەمەنی دەرەوەدا لەسەر دژایەتی نێوان وێنەكان

دروست ببوو، پاشان لە هەشتەکاندا گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر ڕستەی شیعریی تازەدا هات لە ڕێی وەرچەرخانێکەوە لە دەرەوە بۆ ناوەوە، ئەو ڕستەیە لە زەمەنی ناوەوەدا خولّقا، زیاتر فرە ڕەگی پێوە دیاربوو.

شیعر هەڵکۆڵینە لەناو زماندا، لەو پڕۆسەیەدا ئەو ئاواز و ڕیتمانە بەرهەم ناهێنرێ کە پێشتر هەبوون و بیستراون، ئەو هەڵکۆڵینە بۆ دۆزینەوەی ڕۆحێکی تازەیە، هەر سەردەمە و فەرهەنگ و زمانی تایبەتی خۆی هەیە، لەوەش زیاتر هەر شاعیرەو لە زەمەنێکدا زمان و فەرهەنگی خۆی پێویستە.. پرۆسەی هەڵکۆڵین دەروونییەو هەر وشەیەك زاکیرەیەکی گشتی و تایبەتی هەیە، گشتی لەناو فەرهەنگداو تایبەتی لەناو موعانات و ئازاری شاعیر و لەڕێی هەڵچوونی شیعرییەوە دەچێتە ناودامەزراندنی هەیکەلی جوانییەوە، کە شەپۆلی جوڵەکانی ناوەوە دەبێتە مۆسیقا و ڕۆح دەهەژێنێ و ئەو هەژاندنە یاسا و ڕێسای خۆی پێك دەهێنێ.

شیعر موغامەرەیە و ئەوەی ڕۆحی موغامەرەی تێدا نەبێ ناتوانێ جیاوازی بخولّقێنێ. جیاوازی سلوکەو فەرهەنگیشە. ڕەنگە من هەموو ڕۆژێ دارهەناری حەوشەکەمان ببینم، کە ویستم بیهێنمە ناو شیعرەوە، ئەوکاتە من خیانەتی لێ دەکەم لە ڕێی سڕینەوەی بوونی فیزیکی ئەو، لە جێی ئەو دارهەنارێك لە شیعردا دەڕوێنم کە تەواو جیاوازە، چونکە من لاسایی سروشت ناکەمەوە، سروشی خۆم دەخولّقێنم، ئەوەی لەوێدا دەژی نابێتە بەدیلی ژیانی ئاسایی بەڵکو دەبێتە نائاسایی ونمونەی بالاّ و دۆزینەوەی گریمانە

بزربـــــووەكــــــانی ژیـــــــان، ئەوەیــــــان دیـــــــوێكـــــی مـــوغـامـــەرەكـەیـــە.

پاشـان مـەرج نییـە هـەموو كـاتێك شـاعیر بزانـێ چـی دەكـا، ئـەوەی ڕامبـۆ دایـهێنا لــە تێكـەڵكردنی هەسـتەكاندا بـووە مایـەی دۆزینـەوەی ڕسـتەیەكی شـیعریی تـازە كــە تــەواو جیـاواز بـوو لـە ڕسـتە شـیعریی پێـش خۆیـدا. شـاعیر نـاكرێ بـەو چـاوە جیـهان ببینــێ كە زانایـەك یـا سیاسـی یـا فەیلەسووفێك دەیبینـێ، ئـەو كاركردنـە لـە نەسـتدا موغامەرەیـە لە دیوێكی تردا.

شـیعر ڕەنگـی منداڵـی بەرنـەدا باشـترە، بـۆ ئـەوەی هەمیشـە ئامـادە بـێ بـۆ لاسـاری و خۆڕاپسكاندن، منداڵیش بەشـێك نییـە لـە ڕابـردوو بـەڵكو ڕووبـەرێكی بـەیارە لـە ئێسـتا و پەناگەیـەكی هێمنــە لـە داهـاتوودا. ترسـناكترین دوژمنـی شـیعریش گـەورەبوون و یەقینـە، پاشـان جوانـی هـەردەم شـڵەژان دروست دەكات و پـرۆژەی منداڵـی وەكو هێزێك كە ئاسـۆی بەردەمی كراوەیـە، بە تـەواو نـەبوویی دەهێڵێتـەوە. بـەم شـێوەیە مەودا و ڕەهـەندی تـازە لـە بەردەم شیعردا واڵا دەبێ بۆ گەڕان و دۆزینەوە و تازەگەری.

من لەو دیوانـەدا، هـەندێ ئـەزموونی جیـاوازی شـیعریی خـۆم كۆكردۆتـەوە كە لـە ماوەی سـاڵێكدا نووسـیومن، هـەندێكیان دەچنـە پـاڵ ئـەزموونی پێشـترمەوە، بـۆ نموونـە (مـاڵێك بەسەر پشتی ئەستێرەوە) نزیكترە لە ئەزموونی (حوسێن) و (هەمەدان) لـە دیوانـی بزربوونـی ناوێك 2001، كەچی قەسیدەی (هەوڵێك بۆ كوشتنی كات) نزیكە لە ئـەزموونی(باوباڵـەكان) لە دیوانی(بەفرنووس 1999)، سێیانەی (گەڕانەوەی ئۆدیسۆس، گورگی زریانی قرمزی، بـەردی

شەو: ڕووت ڕووت) نزیکترە لـە ئـەزموونی (سـووتانی ڕەنگـەکان) لـە دیوانـی بـەفرنووس.. ئیشکردن لەناو ئەزموونی جیاوازدا دەستی شاعیر والا دەکات بۆ دەربڕینـی زیـاتر و فـرە ڕەنگتر و دەربازیشی دەکـات لـە داخـران و گینگـڵ خـواردن لـە جغـز و شـێوە دەربڕینێکـی دیاریکراودا.

شتێك کە بە پێویستی دەزانم بیدرکێنم، ترسی منە لە دوو شت، یەکەمیان کاغەزیسپی کـە هێنـدەی لێ دەترسـم، جـاری وا هەیـە خـۆم بـە دۆن کیخۆتـە دێتـە بـەرچاو و کوێرانـە دەکەومە دڕاندنیان تا چەند دێڕە شیعرێك دەنووسـم، هـەندێ جاریش وەکو ژنێکـی ڕوح سووك هەرچەندی لێی دەچمە پێشەوە هێندە بەخشندەتر دەبێ لەگەڵما.

دووەمیان کە زەندەقم لێی چووە ئەوەیە، هەرچی نووسیومە و دەینووسم هیچ نەبێ و کەسێك بە شـیعری نـەزانێ، نایشـارمەوە ئـەو هەسـتە بـەردەوام دێ و بـەرۆکم دەگـرێ، بـە تایبەتی کە من خۆم یەکلایی کردۆتەوە، ئەگەر شاعیر نەبم هیچ شتێکی تر نیم.

*

هـەموو ئـەو دەقـە شـیعرییانەی لـەم کۆمەڵـە شـیعرەدا کۆبوونەتـەوە لـە مـاوەی سـاڵی ڕابـردوو (2002)دا نووسـراون، هـەندێ لەوانـە لـە گۆڤـار و ڕۆژنامـەکاندا بڵاوکراونەتـەوە، هەرچەندە دەسکارییەکی ئەوتۆیانم نەکردوون بەڵام ئـەوەی لـێرەدا هەیـە دوا داڕشـتنیانە. هەندێ جار شیعر وەکو گوڵ دێتە بەرچاوان، گوڵـی زینـدوو و ڕاستەقینە کەمتر دەمێنێتەوە لە دەرەوە و زوو دەژاکێـن، وەلێ گوڵـی نـایلۆن و کاغـەز کـە بۆنیـان نییـە زیـاتر دەمێنـن لـە

دەرەوەدا بەڵام لە هەست و یادەوەری مرۆڤدا شوێنێكی تایبەتییان نابێ، شیعریش كە تێكەڵ بە بوونی مرۆڤ نەبێ، نەچێتە ناو هەست و هۆشیەوە با هەر زۆرتر بمێنێتەوە، چی بەچی دەكا؟

*

هەندێ لەو قەسیدانەی ئەو كۆمەڵە شیعرە، شیعری ئاوێتەن، زیاتر لە زەمەنێكیان هەیە، ئەو جۆرە هەستانە لە شاردا دەردەكەون، بەڵام پێدەچێ شاری ئێمە هێشتا فۆتۆكۆپی لادێ بێ بە گەورەكراوی، بۆیە ئەو جۆرە شیعرانە ڕووبەڕووی دیواری ئاسنینی خوێنەر دەبنەوە و كەمتر گوێیان لێ دەگیرێ، شیعری یەك ئاست و یەك ئاراستە و یەك ڕەهەند ئامادەبوونی زیاتری هەیە. ڕەنگە ئەمە یەكێك لە هۆیە سەرەكیەكانی كزبوونی جیاوازی بێ لە شیعری كوردییدا.

وا باوە كەسێك پێشەكی بۆ بنووسێ كە خاوەنی توانا و ناوبانگ و ئەزموونی زیاتر بێ واتا قەڵەمێكی دیارتر بێ، نازانم بۆ ئەو مافەم بە كەس ڕەوا نەبینی. ڕەنگە یەكێك لەو هۆیانە ئەوە بێ، زۆربەی ئەوانەی پێشەكی دەنووسن باسی شاعیرەكە دەكەنو لە دەقەكانو ئەزموونی شیعریی نادوێن منیش هێندە ڕقم لەو جۆرە موجامەلانەیە و پێم وایە دەقی شیعریی هەقی بە سەرمانەوەیە تا قسەیان دەربارە بكەین نەك شاعیر خۆی، جگە لەوە ڕەنگە هۆی دیكەش هەبن لە بن بەڕێ داو هێشتا وەختی هێنانە سەر بەڕێیان نەبێ.

**دڵشاد عەبدوڵلا**

## دوورتر لە منداڵی

لەناو پەلکی گیا پاڵم داوەتەوە
چاوم بڕیووەتە کرمێکی زەرد
بەقەد گیا شیلەی مەراقێکەوە!

شاعیر ناتوانێ قەناعەت بکا
جەستەی شیعرو
جەستەی سروشت
یەك جەستە نین لە دوو دۆخدا
دوو سەری هێڵێك و

بەیانی و ئێوارەی ڕۆژێك و
دووباڵی ئەندێشەو
دووچاوی تەماشاو
یەك ڕستەی سفت نین
بەو هەموو ئیحاو ئاماژەو سیحرەوە.
خەریکە پایز دێ
لە چاوی وردیلەی کرمێکی تووکندا
هەی لەبەر گیاو گیا مسك و
گیا خەوی پەرێزو گیا شەرمی ئەستێرە
لە وادەی پاڵکەوتندا
خەریکە پایز دێ و

بەو چەشنە بەشی ئێوارەیەك ناكا
بەشی تەماشاكردنێكی قووڵ ناكا
بە سەرشانی گۆمێكی شینەوە.
بورجی مێخەك دەخولێتەوە
بە دەوری پایزدا
من تەمەنم بە پێچی سروشت دەپێوم
مێخەك نێرە، شاعیر وتی
ژنەكان حەزیان لە خەونی
ژێر هەوری مێخەك و
حەزیان لە بۆنی سمێڵ و
بن باڵ و قژیەتی

ڕۆژێ ژنێك
نەچۆتە ماڵی پاتۆنیا
لەسەر فەرشی مێلاقەیەك ڕانەكشاوە
یا گوڵە حاجیلەیەكی
نەخستۆتە ژێر بالیفی
وەرزی مێخەك زەرد بووە نێركی
زەرد بووە بۆن و بەرامەی
زەر بووە ناوی.
بێ ئاگاییەكی قەوزەیی
كونجڕ كونجڕە منداڵی
لە بن پەلكی گیا

**نادیارەو موعەمما**

**بەسەر پشتی هەسارەیەکی سۆر سۆری**

**مێینەوە**

**دەخولێتەوەو دەخولێتەوە**

**حەرف و**

**وشەو**

**مۆسیقای**

**ئاڵۆزە ڕستەو پەرەگراف**

**لە چاوی کرمێکی تووکنی نێرینەدا.**

**ژیانم لەسەر ڕستەیەك هەڵخستووە**

بە دەم كزەبای مەعناوە
دەلەرێتەوە ڕۆژگار
هێڵی باریك و
لۆچی دەمووچاو
هەوری عەدەمم گوشیووە
بۆ نەغمەی تەنیایی و بۆ گەرووی وتن و
ئاسمانم كردۆتە كتێب و
زەویم كردۆتە بەرگی.
شاعیر ناتوانێ قەناعەت بكا
لەو دیووی منداڵی وەرزێكی تر نی‌یە
بۆ ڕەنگی پیازیی تەماشا و

بۆ سۆزی قرمزی

عەشقێکی خودایی.

کرمێکی تووکن فێر بووە

دەنووسێ بە لکی مەراقی پایزەو

شاعیر ناتوانێ قەناعەت بکا

دەریا زاکیرەی یەکەم دلۆپی خۆی نیيە

لە شەوێکی کشمیریدا.

من لەشی دەریا دەژەنم

لەش شمشاڵە، ئاوازی

لەو شوێنانەوە سەردەکا

کە پەنجە بەریان دەکەوێ

فەلسەفەی چڵێك فریام دەكەوێ؛
كەسك و تەڕە ئەو كاتەی
گەڵا سەردەكەن بە قۆڵیا.
بۆنی منداڵی دێ بۆنی منداڵی
كرمێكی تووكن و
قەدی مەراق و
گیای وەرزێكی شین
هەرسێكم بە بەندی دڵمەوە گرێدا.
كە هاتی مەچۆوە لێرەبە
ئەو زەردەیە بەشی هەردووكمان دەكا
پەلكی گیا،

جێگەی هەردووکمانی تێدا دەبێتەوە
گوڵێك بەشی هەردووکمان و
بە هەردووکمان بالیفی کرمێکی تووکنمان بەسە
دڵۆپێك،
نیوەی من دەیخۆمەوە
نیوەی تۆ
لێرەبە مەچۆوە تکایە
پێکەوە گلەیی لە با دەکەین
ئەو کاتەی لە ختوخۆڕایی، تۆپەڵە بەفری
مندالّی تواندەوە
بێ ئەوەی هیچ بیانوویەك لە ئارادا بێ

**هەڵیكردو هەڵیكردو**
**هەڵیكرد**
**تا لە پشت گردەكانەوە**
**مردنمان لیٚ پەیدا بوو.**

**ئیتر..**
**لە باخچەیەكدا جێگەی هەردووكمان خاڵی بوو**

**شەوێك، گەردوون لەگەڵ خۆمدا دەنوێنم**
**سوێندی دەدەم:**
**تكایە لێرەبەو مەچۆوە**
**ئەو ماڵە خۆشترە لەهی تۆ**

**لەناو پەلکی گیا دەخەوین**

**بەو هەموو تەماشا و**

**بەو سۆزە زۆرەوە.**

**پایزی** 2002

## ماڵێك بەسەر پشتی ئەستێرەوە

هەموو شەوێ خەو بەماڵێكەوە دەبینم
لە ناو سندوقی بۆراقدا
لە چوار لاوە ڕووناكی لــێ دێتە دەرێ
هەر لەیەكەم سەرنجەوە،
هەرتك چاوم دەنیشێتە
بەر هەیوانێكی نارنجی و تاقێكی شووشە
دەرگایەكی پشت كۆماوەی
هەردوو دەست كراوەی
دەم بەستراودا.

لەلای ڕاستدا: سفرەیەکی نایلۆنی گوڵدار و
هەندێ قاپی پلاسکۆی شین
دووسێ پەرداخی فافۆن و
لەگەڵ ئێکی چینکۆ لە ناوەڕاستیاندا...
کەس لە حەوشەدا دیار نییە
ئەستێرە کەوتوون بەسەر دیوار و
شیشی پەنجەرە و دارمێوی عومردا
کونجی هەیوان پڕ بوو لە عەتری ئەستێرەو
دۆشەك و بالیفی ئیسفەنج،
تەڕ بوون بە ئەشکی شەوێکی
بێدارم.

هەموو شەوێ خەو بەو حەوشەو
شپرزەیی و
سەفەرێكی ناكاو دەبینم لە خۆمدا.
لەو حەوشەیە،
بالوعەیەك كراوەتەوە
چڵك و ئارەقەی مەراق و
خەونی حەرام
گەندەمووی خەمی ڕۆژانە و
تۆز و خۆڵی ناو ماڵ دەبا
لەو كونجەوە تا كەندە پیس
گیایەكی زڕو

**بۆنی سیان**
**کونی لووت و ناوچاو دەزووڕێننەوە**
**ڕێگا پڕە لە حوشترالوك**
**ئەو کاتەی ڕادەکەین بە دوای**
**وەهمی ڕووناکی پشتقوونی ئەستێرۆك و**
**تا ئاوزینگ پێمان تەڕ دەبێ.**
**هەموو شەوێ ئەو دیمەنە گچکانە دەپەنمێن**
**ئەندێشە دەپەنمێ**
**بە تووله ڕێی ئێجگار خزدا دەچێتە خوار**
**تووترکێك**
**فێر بووە تیلماسکی ئومێد**

به خۆیەوە دەنووسێنێ
ئەوسا تێدەگەم
هەر دەگەم بەوەی دەمەوێ
من زەوی کۆنە حەزێك دەکێڵم
شتێك دەچێنم لە شێوەی خەونە
زیندووەکان  جارێك دەبینن
مردووەکان، شتێکی ئەو تۆ دەربارەی نازانن
پێ دەچێ، لە یادیان چووبێ،
منداڵە کەوتۆتە لای سەروو
هەرچەند غلۆر بینەوە
گەڕانەوە گرانتر دەبێ.

لەو حەوشەیە،
کوپەیەك و
کولانەیەکی مریشك و
سەبەتەیەکی لە داری بەلالووکم جێ هێشتووە
دوو فەرخەی قەتێ لە ژێریا
لەترسی پشیلە
ئەو دیمەنە دەسڕمەوە
منداڵیم دەمێنێ، وەك پاشماوەی خەونێکی خۆش.
هەندێ جار، لافاو گیایەك
لەبن و بۆتکەوە دەردێنێ؛
بەڵام هەنجن هەنجنی ناکا

هەر بەو مەنتیقە
دەرگای ماڵی منداڵی خۆم،
لە پێخەوە هەڵكێشا.
لەیەكەم دەركەوتندا، چاوم كەوت
بە دزێك
دیواری ماڵی كانەبی كافرۆشی دەبڕی.
لەپشت درەختێكدا خۆم حەشاردا
ئەوسا كەمەرم هەر هێندەی قەدی توو بوو
دەفەی شانم،
هێندەی پنجی مێخەكێك و
سەرنجم بە قەد پەلكێ بوو

بەونیگا باریکە تەماشای
ئەو دیمەنە وردانەم کرد لە شەودا
کێناڵێ ڕێگای سەفەرم،
ناچێتەوە سەر ئاقاری دیوار بڕە ناقۆڵاکان؟
لە خۆم پرسی.
شەو دوو شەو بوو
شەوی من و
شەوی دز و
شەو یەك شەو بوو
شەوی من و

شەوی کچەکەی کافرۆش،
لەپشت دیوارێکی قوڕدا.
لەو دەرگایە بە ئاسانی هاتمە دەرێ
چەند زەحمەتە
چوونەوە بۆی
لەو شەوەوە هەموو شەوێ
گوێم لە دەنگی دیوار بڕە
لەپشت پشتێنی سنوور و
لەپشت شەوی وڵاتان دا
لەو دیو تەمی نێوان شارەکان
گوێم لە نووکی ترسێکە

**بێدەنگی کون دەکا**
**هەمان دەنگی دیوار بڕ و**
**هەمان پیاوی ناوشان پانە.**
**تنۆك تنۆك لە ڕابردووەوە دەرژێمە ناو چاوی ئێستاوە**
**لەو کۆڵانەوە بۆ ئەوی تریان**
**لەو شارەوە بۆ ئەوی تر**
**باژێڕان دەگەڕێم**
**بۆ چەرخوفەلەکی سیحرێك**
**بمبا بۆ ئەو دیو گۆی زەوی**
**تا هێزی خۆم لەگەڵ خورافەی ڕووباران تاقیکەمەوە**
**هەوایەك، هەمیشە هەوایەك بۆتە مس**

**ببوورە، بۆتە قوڕقووشم لە گەرووی شەودا**
**هەوایەك هەمیشە هەوایەك**
**کڵاوی سەر بەڕووی مەراقم دەڕفێنێ**
**شمشێری ڕەخنە، نیشتۆتە سەر ملی ڕستە و**
**زەنگیانەی وشە دەپچڕێ**
**بەداوی قسەوە**
**من بەو شەرمە سوور هەڵگەڕاوم**
**شەڕم لەگەڵ دەنكی هەنارە لە توێكڵی خۆمدا.**
**بەو شەرمەوە كەپێی ناسراوم**
**چۆكم داداوە**
**لە ئاستی جوانی ئاسمان دا**

هەر بەو شەرمە چوومەتە دۆخی شەونمێك
لە چاوی بەیاندا
چیم لێ دەکەی، ئەی خوا!
کەمن هەموو نهێنی کەوتن و
هەرەسی تەمەنم
بە خۆڕایی بەدار خۆخێك وت
ئەوەی کەس پێی ڕەوا نەبوو
من بەگەڵای گیایەکم ڕەوا دەبینی.
لە بارێکدا، لەگەڵ هەورێکی سۆزانی
دوو بە دوو دانیشتین
لەگەڵ دوورترین ئەستێرەی قوربانی

دوو بە دوو دانیشتین
لەگەڵ یاخیترین ڕووبار
لەگەڵ سەرکێشی ڕەشەبا و
شیعرێکی لاسار و قژ لوول و
جگەرە بەدەستدا
دوو بە دوو دانیشتین
خواردمانەوە و
خواردمانەوە و
خواردمانەوە
هەتا بەیانی نەنووستین.
لەوساوە هەتا ئێستاکە

**نە دەنکی هەنارم**
**نە دەنکی هیچ شتێك.**
**ئێستاكە، كە دەگەڕێمەوە؛**
**بەو چاو قایمیە**
**ڕەنگە دایكم، بپرسێ: كێ وای لێكردی،**
**كێ؟**
**گەواهی لەسەر كێ بدەم،**
**كێ بكەم بە شایەد لەسەر خۆم؟**
**كێ وای لێكردم،كێ؟**
**چل و شەش مەلی دەنگ خنكاو**
**هەریەكەو بە ئاوازێك و**

له باخچه‌یه‌كدا
ڕاوچیه‌ك كوشتوونی
( من چل و شه‌ش مۆمی كوژاوه‌ و
چل و شه‌ش كوژراوم
له‌ چاوێكی چاوه‌ڕوان دا )
چل‌و شه‌ش كوڕی سه‌ركێش و
چل‌و شه‌ش چرۆی پشكووتوو له‌ به‌رد دا
هه‌روه‌ها چل و شه‌ش بابی حه‌كیم و له‌سه‌رخۆ
چل وشه‌ش چرای هه‌ڵكراو له‌ شه‌ودا
له‌ چل و شه‌ش ڕیگاوه‌ هاتوون؛
بچم به‌ پیر كامیانه‌وه‌؟

**کامەیانە باوکی شەرعی**
**کوڕی شەرعی کامەیانە؟**
**( من لە نێوان کوڕ و باب دا**
**تخوبێکی بەزێندراوم ).**
**چل و شەش ژن**
**بە چل و شەش دەستوور و تاراوە**
**هەریەکە و شتێکی لەلا دانام**
**هەریەکە و شتێکم لایانە**
**ڕەنگی پرچم چۆتە ڕەنگی کامیانەوە؟**
**شەوقی تەماشا و سەرسامی و**
**دۆش دامانم لای کامیانە؟**

پەنجە دەكرۆژم
هەر دەپەنجەم تامی وەڵامێك نابەخشێ
كێ وای لێكردی، كێ؟
كێ وای لێكردم، كێ؟

تشرینی یەكەمی 2002

## تکا

خەو بە ژنێکی مردووەوە دەبینم
بەیانی، گوڵێك لە باخچەکەمدا
لە بن و بۆتکەوە وشك دەبێ.
ئەو ژنە جارێك نەبۆتە میوانم
تا ئەو گوڵە،
پێشی کەوتبێ تا بەردەرگا و
فەرموو فەرمووی لێ کردبێ
بۆ ژوورەوە
ئەی ئەو گوڵە بۆ خۆی کوشت و

**بۆ بووە قوربانی،**
**ژنێك كە پێشتر نەیناسیووە؟**
**ئەك لەبەر ئەو گوڵە!**
**خەو بە ژنێكی مردووەوە دەبینم**
**بەیانی، پەنجەرەی ژوورەكەم دەشكێ.**
**لە كتێبی خەونەكاندا، ئەو خەونە،**
**بەو چەشنە لێكدراوەتەوە: گۆیە،**
**لەش و شووشە دەستە خوشكن**
**هەموو شتیان هەموو شتیان وەكو یەكە**
**خامۆشی و وردوخاش بوونیان**
**ساف و لووسی**

هەموو شتیان هەموو شتیان.
شینی شووشە هی ئاسمانە و
شینی لەش هی ئەستێرەیە لە ڕژاندا
بەو شێوەیە،
شووشەی من شکا
لە ئاستی ژنێکدا.
خەون بە ژنێکی مردووەوە دەبینم
بەیانی چاوێکم کوێر دەبێ
ئەمە چ جۆرە دادپەروەرییێکە،
دووچاو بەشی دیتنی جوانی نەدەکرد
چی ببینم بە یەك چاوی وردیلانە و

دڵێكی شكاودا.
خەو بە ژنێكەوە دەبینم
چۆتە لێواری مەرگەوە
خودایە سەرپشك بە!
ماڵم دەڕمێنی؟
خۆم و باخچەكەم دەكەیتە قوربانی؟
چیم لێ‌دەكەی سەرپشك بە
بەڵام نەكەی لە خەونیشدا
بۆ هەر بیانوو و مەبەستێك
مەرگی ئەو ژنەم نیشاندەی
كە خۆشم دەوێ.

# گەڕانەوەی ئۆدیسۆس

مەچۆرە ژووری
گوناحە وا زوو دەرگا دابخەی
ئێوارە نەبینی،
چۆن ئەوشەوە بەسەردەبەی؟
"گۆرانی ئۆدیسۆس بۆ بینلۆب لەکاتی گەڕانەوەیدا"

**شەڕکەرێك بەسەرپشتی کەڵەکێکی شکاوەوە، لەشی لە درەختێك دەچێ**
**رۆح گەڵاکانی بێ. گۆزەی ڕووناکی قڵپ دەبنەوە ناو ئاوێ،**
**ئەوەی تێیاندایە دەڕژێ.**
**شەڕکەرێك دواى ڕووناکی ڕژاو کەوتووە.**
**سەرم سوڕماوە لە سیحری ئەو شەڕکەرە ( با دە هاژواو پرچی**

شەوی پێ‌رەش دەكا ). رووناكی دەدزێ‌و لە كونی دەرگاێكەوە
دەیباتە ژوورێ/ دەیدا لە جلی نیوە رووت/ دەیدا لەگوڵی
سەرخۆشی ناو ئینجانەی سوچەكان‌و رەنگی‌چیتێك
دەبریسكێتەوەو سەمایەك وا بە دیارتەوە.
مەست دەبی بە پیاڵەی لەشی باریك‌و شەوێك ئەو خەونە
باریكە دەبەیتە سەر جێگەی نووستن‌و گۆی ئەستێرەێك
دەپشكوێ لە ناو دەمتدا، مامزێك لە پووش‌و پەڵاشی
ئێوارەی مەراقێكدا دێتەدەرێ‌و دەكەوێتە ناو پەرداخی
ژنێكەوەو دەیخۆێتەوەو دەیخۆێتەوەو دەیخۆێتەوە.
دەپرسم : مانگ بە چ زمانێك تریفە دەهاوێ / من بەو زمانە
پێ‌ی دەڵێم، لەسەرخۆ خۆی بدا لە لەشی ئۆدیسۆس؛

ئەو قانە زەوی‌یە ئەسمەرە پڕبووە لە گوڵی بەهارو
هەر زارکی برینێك کولیکێك دەمی تیناوە / بەو مەنتیقەی
هەمیشە ماسی گەورە بچوك قووت دەدا؛ دەمی گەورە
خونچەی بچوك هەڵدەلووشێ.
شەوی یەکەم: ژنێك لە تەنیشت پەنجەرە هەر تەنیا لایەکی
دیارە، ئاسمان لە جوانی بازنێکدا چۆتە ناو دەستی راستی‌یەوە،
ئەو دەستەی خستۆتە ناو دەستی ئۆدیسۆس ئەویش شەڕی
تەروادەی پێ کردووە.
شەڕ پریاسکەی هەر یەکێکمانی پێچاوە بۆ شارێك،
شەوەکانمان لە حەشری مێرگێك دەچێ، لە ناو بۆنی
گوڵەکانیدا/ یا لەشەوی درەختێك دەچێ، بە دیار بارانەوە

خەوی لێ کەوتبێ.
تۆ لە شیعرێکتا نوسیووتە: لە شەوی دووەمدا: بەسەر
پشتی ئەندێشەیەکی ئەبەنووسیەوە/ئومێدراوەنێی
تا تخوبی عەبەس/ تا دەگەی بە عەشقێکی‌نامراد/ دەکەوی
بە دەمدا لەسەر فەرشێکی لاکێشی شینی تاریکدا. تۆ نوسیووتە:
ئیتر من و عەبەس لووتمان تەقی بە لووتی یەکتریداو پێکێکی کۆن
هەردووکمانی هەڵدا تا مەست بوون. ئەو کاتە خوێنی خۆم
بینی لە ناو پەرداخێکەوە ، رژابووە سەر پێخەف و سەری بڕاوی خۆم
دیت لەسەر سەریندا.
چیت کرد، پاشان چیت کرد؟
ئەو هەموو مۆرییە گرانبەهاو ئەنتیکەو ئەو هەموو غەزەلە بەسەر

**پشتی کوندێکەوە/ ئەویش بە دەستی ئەشقیاو قاچاخچیو**
**کەمتیاری ناو ئاوەوە،**
**پاشان چیت کرد؟**
**لە شەوی دووەمدا: من و داری سنەوبەرێك، منداڵی خۆمان**
**بەراوردکرد لەگەڵ منداڵی دەریا، هەردووکمان لە پڕ گەورە بووین،**
**پاشان چیت کرد؟**
**زەنگێك لە چەشنەی قاسپە خوێندی ، لە ژێر بەفرێکی خەمگینی**
**واهیمەدا؛ کەس دەرگای بۆ نەکرایەوە.**
**یا بەشێوەیەکی روون و راستەوخۆ بڵێم، نە دەرگا لە ئارادا بوو،**
**نەکەس هاتبوو لە دەرگا بدا. لەوناوەندەدا**
**ناوی خۆم دۆزیەوەلەسەر قەدێك/ لەو قەدەوە چوومە**

**ژووری، بەڕێكی پڕ خەتی نارێك و دیمەنی نادیار / لە شێوەی**
**لاقێكی درێژ / پێشم كەوت / بردمی بۆ لای مۆمدانێك/**
**ئەو هەموو مۆمە، تەمەنیان پڕ كردبوو لە شەوق و تارمایی**
**من ساتمەم لە گرێیەك كرد كە چڵێكی سەركێش**
**دابووی لە عومری درەخت و / لەسەر كورسی‌یەك دانیشتم لەتەك**
**هەورێكی نارنجی/ پاڵتۆكەم داكەندو ملپێچ و قەیتانی قۆندەرەم**
**كردەوە، شەرمم لەو كورسی‌یە نەكرد تا ئەو ئاستەی شەرمم**
**لە ئاو نەكردووە، ئەو كورسی‌یە لە سیحربازێك دەچوو**
**لەناو دوكەڵێكی سووردا ، یا لە پشیلەیەك**
**دەچوو؛ لە ژێر زەمینێكدا / لەوەش زیاتر لە تارماییەك**
**دەچوو، چووبێتە ناو سووچی كابووسێكەوە/ من لەوێدا**

**خەوم لێ‌کەوتبێ؛ باڵندەی ئەو کابووسە لەسەر لێفەم**
**هەڵنیشتبن/ دەنووك بدەن لە لووتی شیعرێکم و**
**من لووتم درێژ بووبێ و بەو لووتە بۆنی مردنی خۆم کردبێ.**
**ئەوشەوە لە شەوێکی کوژراوی ناو هەناوی جەنجاڵیەك دەچێ،**
**بەیانیشی**
**لە دیمەنی ژنێکی شیرازی لە لاجانگی شیعرێکی**
**حافزەوە کەوتبێتە سەر فەرشی جوانێکیەوە.**
**تەمێکی شەرابی لە دەستی خەیامەوە کەوتبێتە**
**خوارێ/ ئەو تەمە بردمی‌یە بەردەمی ئاوێنەیەکی لێڵەوە**
**هەر بە تەنیا قەراغێکی بەرسیلەیی بەس نەبوو تا دڵی**
**گوشراوم ببینم بەرامبەرم، ئەو وێنەیە شەوەهای شەو**

لەناو بەلەمێكی بچوك/ لە تەكمدا/ بە دوو دەستی كافووری
تاریكی ڕاوناوەو بە ژیلەمۆی سەرمای دەركردووە.
لە خەونی فەرشێكدا بەنی راستم چووە بە ناو پەنجەكانی
بەنی چەپدا / بۆنی بخوور لەو نەخشە دێ، ئەوە منم هاتوومەتەوە
شیرو تیری تەرواده نەیپێكاوم تیری غەزەلێكی رووتی تۆ پێكامی.
گەڕاومەتەوە ناو ڕستەیەكی پڕ تەمومژی ناوی خۆم
جلەكانم لەسەر تەنافی بالكۆنی یادێكی سامالّی هەڵخستووە،
بۆنی سابوونێكی كۆن و مووی كۆن و قەوزەو خۆشووشتنێكی
كۆن / دیواری گەرماوی ماڵەكەمانی شین كردووە، بە هەمان
ئەو مانایەی كێڵگەیێك پاش باران بە گیاو گوڵەكێوی و لاسكی
كافووری شین دەبێ. تەماشا پەشتەماڵی ئەرخەوانی

**گوڵ‌گوڵی ئاچووخ و حەوزی خۆ شووشتن و شێوەی**
**لەشی بینلۆب لە شێوەی کوکوختی‌یەکی نووستوودا**
**خۆیان دەنوێنن، بۆنێك دێ لەوناوە و ئەو بۆنە توند**
**دەمگرێ بە خۆیەوە. من لە کونی دەرگاوە ( خەون دەیبردمە**
**ژوورێ ) تەختی نووستن و کەنتۆری کراوەو جلەکان دەبینم؛**
**بێباکانە فڕێ دراون بە دەوری ئاگردا ، پشتێکی تەواو ڕووت**
**لامل و گۆی مەمکێك تەسلیمی گەرمایی کراون/ قافیەی**
**قژێکی رەشی تۆخ تێکچووە، بە دەست شیعرێکی ئازادی**
**رووت رووت دا. خشپەیەك دێتە ناوەوە/ لەو خەوەوە**
**دەمبا بۆ خەوێکی گێلاسی ترەوە، شوێن پێی رۆخ ئاوێك**
**دێتەلام، تاڵە موویێك لەسەر بەردێکی مەڕمەڕی بریسکەدار**

خۆی دەردەخا، کەڵەکێوی‌یەك لیێ تێکچووە، هەر بە خەیاڵ
قۆچی لە تەختی فەرهادێك گیر بووە، لەبەرئەوەی سەرو لمۆزی
لە ئاسك چووە. تەماشا ناوم لەسەر قەدی دار قەزوانێکدا
رەش بۆتەوە، بۆنی ئەو ناوە کەوتۆتە سەر زەوی‌و
ئەو ناوە پڕ بووە لە پەرۆشی گەڕانەوەم.
خوابتگرێ دڵشاد! لەشەوی دووەمدا ، کوا خەونی خەنەیی
لەو چەشنە هاتووە موویەکم رەنگ بکا بە رەنگی کابووسی؟
کە دەتزانی من ئەو ژنە نابینمەوە بۆ نوسیووتە:
کەسێك لەوێ چاوەڕێ دەکا.
واهیمەی ئاوو زمڕوت‌و لەعل‌و بەدەخشانی.. من هەموو
ئەوانەم لیێبۆتە دوگمەی کراس‌و زنجیری قەمسەڵەو نێرو میێ

**مەمکدان و بەردم لیٚبۆتە مێ، ئاوم لیٚبۆتە مێ و،**
**ماسی‌یە نێرەکان خۆیانی پێدادەدەن.**
**کورسی و مومدان و دۆشەك و کتێب و کاغەزم لیٚبۆتە**
**مێ، لەش لە شێوەی بایەك هەڵدەکا من شەرم**
**لەو بایە ناکەم.**
**ئەو بایە ناگیرێ و هەڵدەکا و هەڵدەکا و هەڵدەکا**
**ئەوبایە نەبووایە ئەو هەموو ئاوانەم چۆن دەبڕی**
**بەسەر پشتی کەڵەکێکی شکاوەوە**
**ئەو بایە نەبووایە؛**
**من لەکوێ دەبووم و نیشتمان لەکوێ دەبوو.**

**کۆتایی** 2001

## گورگی زریانی قرمزی

**خواوەندەكان بەو درەنگەی ساڵێ دێنەوە ناومان**
**هەرچی زوقمو بەستەڵەكی سەربانی ئەستێران هەیە، هەمووی**
**ڕادەپێچنە سەرزەوی.**
**هەرچی فرمێسك و گوناهی**
**ئاسمانیەكان هەیە، هەمووی**
**بەسەر ماڵی ئێمەدا دەبارێ.**

- **كێیە...؟**

خەڵکی ئەو خاکەم و هاتووم، دەنکە خۆڵێك پەڕیووەتە
ناو چاومەوە.

• کێیە.. کێ ئەو شارە دەهەژێنێ؟

شوێنەواری زریانێك جێماوە، ئەو زریانە لە بەردێکی ڕەشی
مەیلەو سۆردا هاتۆتە دەرێ، لەو شوێنە گورگێك پێی
داوە لەزەوی،
ئەو زەوییە سێبەری هەورێکی بەسەرەوەیە،
ئەو هەورە لە پەرداخی شەوێك دا مەست بووە،
چەندە شیرین قسەدەکا،
دەنك دەنك حیکمەتی دەڕژێتە خوارێ.
دڵ چی بکاو دڵ چی بڵێ؟

گالیسكەی میرێك بەڕێوەیە،
دوو ئەسپی شین ڕایدەكێشن
تەقەی ناڵیان لەگەڵ دەنگی كەڵەشێرێك/ پێكەوە دەگەنە
ڕۆخی ڕووبارێك، گیا تازە لە خەو هەڵساوە، بەری بەیان
گوانی چێڵێك نوێژ دەكاو زەوی سەرسامە بەوەی دێ
سەرسامی شیعرێكە، خۆر لە بەری بەیاندا دەینووسێ
دەم گۆناكا و من لە پەلوپۆ دەكەوم لە ئاستیدا.
سەری زریان چۆتە ناو دەمی گورگێك و
ئەو گورگە لە ئاوایی نزیك دەبێتەوە.
ئەوەی تاریكی فڕێی دا زەریاوە
شەو هەڵیداو دواقوومی خواردەوە

**بەو سپێدەیە،**

**لە کەژاوەیەکی زەرکەفتی کەشکەشی بریقەداردا، دێتەوە ناومان.**

**تێر نەبووم لەو ڕووناکی‌یە دەمم ناوە بە نووری خواوە**

**ئەفسانە لە شێوەی برۆیەکدا، لە تەختی بێستون دا دەرکەوت**

**ئەو برۆیە دەبوایە شاری هیندی بۆ چۆڵکرابایە/ ئەو لەسەر**

**تەختی پاشایان دانیشتبا و حوکمی ئینس و جانی کردبا،**

**لە هەوشار و عەجەمان ئەستێرەی قرمزی بۆ هەڵهاتبا/ بەو**

**ئەستێرانە چاوی پڕکل و دەرمان کردبا/ هەر عاشقێك و کەوچێك**

**لەو نیعمەتەی بەرکەوتبا؛ گوناهی نەمابا تاڕۆژی ئاخر زەمانێ.**

**بێستون بنی چۆتەوە سەر ئاوێك و ڕووناکی لێ هەڵدەقووڵێ**

**کەچی تاریکی ڕژاوە بە بالآیدا.**

ئەفسانە لە شێوەی کوڵمێکدا
سوور دەچێتەوە لە قەدیا، ئەو کوڵمانە دەتووت فانووسی
غەیبێك و هەتاوی مەملکەتێکن کە خۆری لێ ئاوابێ،
جواناس و غەیدیت و سوڵتان و مەولەوی بەو شەوقی
ئیرۆسە دەدرەوشێنەوە،
من میرزام بەو هەموو مەیلەوە شووشەی سیحر دەکەمەوە،
شووشەم لێ دەڕژێ و سەرزەوی پڕ دەبێ
لە بۆنی مەیلێکی شێتانە، عەترو سملێ لەو کوڵمانەوە دەڕژێن،
هەر بۆنێك و شیعرێك دەیخاتە باخەڵی.
مردن تەیرێکە و خوێندنی بیر چۆتەوە
من بوومەتە موستەعیدو بێ مامۆستا ئایەتی عەشقێك دەخوێنم

له کتێبێکی کراوەی نیوه شەودا
سەد باڵنده به سەرشانی ڕاستمەوه
سەد باڵنده بەسەر شانی چەپمەوه
تەواو له داری قەزوانێك دەچم بەو هەموو فەریکەوه
هەر گەڵایەك و هەرجوانییەکم له مەملەکەتێك کڕیووه
له دەزووی ڕووباردا گۆرەویم بۆ سەرمای زستانم چنیووه
له گەنجینەی خۆڵدا تامی یاسەمینم هێناوەته ناو حەوشەی
هێشووەکانمەوه
پەنجەم خستۆته ناو ئاوێك، که بەرزم کردۆتەوه
له ئەلفێك چووه/ ئەلفی ئاگری بالایەك، ئەو بالایه
ناچەمێتەوه بۆ گوڵی شۆڕان و ئافات.. ئافات/ من خۆم

تەسلیمی تەماشەیەك كردووە؛ ئافات نەمبا، پرچی ئەوم تێ نەئاڵێ
ئافات... ئافات
من هەر هێندەی مێخەكێك بمێنمەوە، بۆنم بپژێنە ناو لووتی
خواوەندێك و ئەو بپژمێ،
باخچەیەك لەو هەناسەوە بێتە دەرێ
ئەو باخچەیە پڕ تەیربێ ، ئەو تەیرانە بچنەوە هەر شوێنێك
هێلانەی منداڵیم لەوێیە،
بەو شێوەیە منداڵیم لە بۆندا
دووبارە بێتەوە، من ئەوەم مەبەستە
بەردێكم لە تەورات و لە علم لە ئینجیل و پەڕم لە قورئان و
ئاگرم لە ئاوێستا،

**گیایەك دێ بە پیرەمەوە پشتی لووسەو**
**ناو هەناوی شەقار شەقار. هەورێك دێ**
**بەکراسی ڕەنگاو ڕەنگی ناو بیرێکەوە، گورگێك بۆنی دەکا.**
**ئەو جلانە هونەرمەندێك بۆی چنیووم**
**لە ڕەنگی سووتانی قەقنەس و**
**ئەفسانەم بە گیر هێناوە لە کونی قۆپچەی**
**کراسی شینمدا**
**جنۆکەیەك فێربووە هەر شەوەو وێنەیەکم**
**دەباتە باخەڵی خۆیەوە/ سبەینێ نەوەیەك**
**بەو ڕەنگە پرتەقاڵیەوە تەماشای ماڵی فیرعەون وموسا دەکەن**
**شار پڕ بووە لە سیحرو هەر ماڵێك و**

پەنجەرەی سیحرێك دەكاتەوە
هەموو شەوێ شیعرێك لەو پەنجەرانەوە
تەماشای مانگ دەكاو مانگ لە بەرجوانی یوسف خەوی
لیٚ ناكەوێ.
ئاوی چاوم بەستوویەتی، چەند بەشەرمەوە ژنێك
دەمباتە سەر دینی خۆی
فێری خەوتن و خەودیتن و
ناڕەحەتی و شتی تر و شتی ترم دەكا، وام لێهاتووە
لە پێخەفێكی حەلاڵ و بن ساپیتەی ماڵێكی شەرعیدا
خەوم لیٚ نەكەوێ.

- ئەو درەختە لەگەڵ شۆستەی خۆی هەڵناكا

ئەو ڕووبارە لەگەڵ ڕۆخی خۆی ناخەوێ.
من چی بکەم؟
شاخنشینێك چاوەڕێیە
بەیانی‌یەکی بۆ ببەم، بیخەمە ناو سۆپاکەی‌و
چایەکی گەرم پێکەوە بخۆینەوە.
با لە چیا لە دایك بووە، با خووی چیای نەگرتووە لە نەفس بەرزیدا
من یەکەم جار کە بام بینی تەواو شاگەشکە بووم
بە سیحری
ئەو خۆی بە پانتۆڵ و ڕۆخی تەنوورەو کراسی
ژنەکان خەریك دەکرد، وا دەهاتە بەرچاو کوڕێکی شەرمنەو
تەواو ئێسك سووك ، کەس نەیدەبووغزاند

كەس لە بنكەی پۆلیس شكایەتی لیّ نەدەكرد، پاشان
كە باشتر ناسیم، هەتیمێكی بێ داك و باب و
لە قوتابخانە هاتبووە دەرێ و تەشقەڵەی بە هەوادەكرد
كچەكانی گەڕەك دەیانناسی
با هەر هێندەی پەڕەسێلكەیەك گۆشتی پێوەیە،
ژنانی گەڕەك دەیانووت
ئەی با!
مشتێ لەو خۆڵە هەڵبگرەو گوێگرە؛
ماڵەكەت بفرۆشە
لێرە شاعیرێك چاوەڕێ دەكا
ماڵەكەی خۆیت بداتێ.

تەماشا: گورگێك لموزی ناوە بە دەرگای ماڵێکەوە
ماڵ چۆتەوە ناو کونی دیوارو بن میچی پڕبووە
لە تەیرو
ئەو تەیرانە خوێندنیان لە بیرچۆتەوە.

## بەردی شەو: ڕووت ڕووت

نهێنی شەو لەناو كۆنە جەڕەیەكەو زاركی بە شەمێ گیراوە
سمۆرەی خەنەیی بە قەدیا هەڵدەگەڕێن، باز باڵیان
تا ئەوپەڕی خەیاڵ دەكەنەوە، تاوس دەگەڕێن،
بن باڵیان پڕ بووە لە ئارەقە.
لە پشت شووشەی پەنجەرەوە، چاوێك
ئەستێرەی جەدیەو لقێكی تەماشای
شۆڕكردۆتەوە.
لەپشت هەورێكی مۆرەوە، گوڵی ناوێك خۆی كردۆتەوە

**مەلێك دەیگرێ و بایەك دەیگرێ و دەینووسێنێ بە خۆیەوە**
**باڵەکانی من هێنایان مەل وتی، کزەبای باکوور تەفرەیدا**
**دای بە کۆڵی چەمێکی کوێستانیی تووڕەوە.**
**"کەناومان لە تۆنا**
**یەکەم باران دای لە زەوی**
**پەلکێك تەڕبوو لە حەوشەکە**
**من ئیلهامم لەو پەلکە خواست."**
**ئەو ناوە لە گوێ ئاوێکدا وردەماسی کۆدەکردەوە،**
**لەدەماری شینی رووباردا.**
**کرم و مێشوولکە و جرجانەوەر دەوریان دا**
**چۆلەکەی گەردن زەرد بۆیان خوێند، ماسیگرێکی قەزوانی**

كتومت ئەو بوو لە ڕەنگدا، تۆڕی هەڵداو ئەو ناوەی گرتەوە.
ئێوارەیەكی درەنگ سپاردی
بە هەورێكی بەرزە فڕو ئەویش كردی
بە پوولەكەی پشتی باران.
بۆ كوێ بچم هەر بارانەو
ئەو ناوە هەرتەنیا ناوێكی ڕووت نییە لە بەردەم ئاوێنەو ناو ئاوو
پێخەفی نووستنی كوڕێكی ئەسمەرو قژلوولدا.
ئەو ناوە بەزەحمەت دەبێتە لۆكەو دەچێتە قۆزاخەی سووری وەحییەوە،
پەیامێك لەو ساكەگۆڕەدا دەیكاتە گوڵزارو تا بەرەبەیان نوێژی بۆ دەكا،
شالوورێك لە شێوەی غەزەل دێ عەشقی ئەو سوورە ئاماڵ شینە دەبێ،
من ئەو غەزەلە دەڵێم و

ئەو غەزەلە دەڵێمەوە.
شەو چۆتە دۆخی مەراقی کچێکی دۆستەوە، ئەو دۆستە
هەر جارەی بە بیانوویەك تەماشای، ئەستێرەیەکی
ڕووت ڕووتم دەکا، لە فینجانی ئاقیقی ناسك و
پڕ نەزاکەتی‌دا جێیان دەکاتەوە.
تەماشا: ئەو نەخشانە نیوە ناچڵ لە بنی فینجاندا
هەڵدەکشێن تا پەنا گوێچکەو شل شل دەبن بە ماچێکم.
ئەو نەخشانە بازێك لێرە بەجێ‌ی هێشتوون، ئەو بازە هەتا بەیانی
لە فڕینی خۆیدا گەوزی‌و تێر نەدەبوو،
تۆ خەونی خۆتیان تێ هاوێ دۆست وتی.
نێرو مێ بوون ئەو نەخشانە، ڕەنگی یەکتریان گرتبوو،

جوكە جوكیان بۆ جووت بوون و لە گوێ چۆماواندا زاریان كردبووەوە،
هەر هێندەی نزایەكی باریك مابوونەوە، لە زۆرشتی ئێجگار جوان و سەرسام دەچوون.
مەبەستمە ئەو جوانی‌یە بچوكانە خڕكەمەوە
ئێجگار پەرۆشم بۆ پەرستنیان.
شووشەی عەتری شەو كەوتووە بەدەمدا، بۆنی كراسی خوێنین و هەمان سوورەتی یوسف و
هەمان شەوی شەهرەیارە.
شتێكی ئەو تۆنەماوە لە دوێنێ، شیتاڵ شیتاڵیان كەوتۆتە قڵیشی بەردەوە،
بەرد شوێنی مارو مێروو لە كنەخۆی دەكاتەوە،
ناوێك زەردەپەڕ دەییات و هەر بەو ناوە بانگتان دەكەم!
سیحرێكی ڕەش چۆتە بن حەرفەكانیەوە،
زمان خرۆشاوە بۆ وتنی،

**کە جوانی دەرکەوتووە لەوێ،**
**شڵەژاوە ڕێزمان و ڕێسای وتن. فەرهەنگێك بزری کردووە،**
**بەو شێوەیە:**
**مەراق داویە بە مەراق و ڕستە بە ڕستەی دواتری سپاردووە**
**ناوێك.. تیلماسکی ئەندێشەی هەتا ئەزەل درێژبۆتەوە**
**سەرزاری پڕبووە لە پونگ،**
**جا ناوێك بەس نییە؟**
**ئەی شەو! تەلیسمی بۆنەکان بکەوە، قژیان پەخشکە بەسەرشان و مل،**
**بۆنی لەش دەڕوا بەناو بۆشایی وجوددا.**
**پرچی بۆنەکان بکەوە،**
**مردووەکان دەمێکە چاوەڕێی بۆنێکی وان.**

بمكەرە تریفەی بانگدانێك لە بیابان دا
بمبە مەرقەدی حەللاج و بمنووسێنە بە داری هەقەوە
بمكەرە پەڕێكی كریشنا بە باڵی زەڕنە قووتەی خەیاڵەوە
بمبە باخەڵی ژنانی تاهیتی وشان دادانی
ڕەنگی سووری بەیانیباشێكی (گۆگان) لەبەر دەرگای كازیووەدا
بمكەرە خەونی ئازادی باڵندەیێك، دەنووك نەدا
لە دەنكە جۆیەك نەبادا ببێتە كۆیلەی كێڵگەكان،
بمكەرە ناماقووڵی كامۆ لەكەناری جەزایردا، بمدە دەست شمشێرێك لە هاراكیریدا.
ئەی شەو.. تكایە ڕووت وەرگێڕە
سوور هەڵگەڕاوە وادەی هاتنم
سۆربۆتەوە گەرووم هێندەی بانگت بكەم: ئەی ناو!

بەناوێك دەست پێدەکەم، هەر پەرێزێکی پۆلەمەلێکمی بەسەرەوەیە.

درەنگە بۆ فڕین

ئێوارە تیر واسکێك یا لەقلەقێك

لە گوێ ئاوان دا: لە دار گەز دەپرسێ:

ئەنگۆ شتێکو نەدیووە

هەر هێندەی گوێزێك

لەشەودا هەڵتۆقێ؟

هەر هێندەی دەنکە قاوەییێك بەسەر تاڵی مووی عەزاب و

هەر هێندەی خرۆشانێك بەسەر تەلی تەماشاوە؟

چاوێ ئەستێرەی جەدییە و

لاسکی نەعناع بەبۆنی دەکەوێ، نهێنی شەو

له بن گۆمه ئاوێكدایەو
ئەو گۆمه له چاوێكی زەردی مەیلەو قاوەییدا،
زاركی بایەكی سەرساری بەستۆتەوه، له كونی ئەوچاوەدا
كۆترێك دەفڕێ
لافاوێك وا بەڕێووەیه.
من هەقی قسەكردنی ڕەهام داوه به ئاو!
ئێستا مەلێك دێ و بایەك دێ و باڵ لێك دەدا
بەناوێك هەر هێندەی دەنكه گەنمێك
بەدەنووكی كۆترێكەوه
بانگی شەو دەكەم، جەڕه پڕبووه له سیحری ناوێك
ناوێك به زەحمەت دەگیرێ ماسی حەرفی بزوێنی

**بە زەحمەت لە فڕین دەکەوێ خاڵی سەرو خاڵی ژێری**

**تووکی پڕە لە مەراقی دەربڕین و لە پشت**

**هەوری زەعفەران دا**

**کلوکلو دێنە خوارێ حەرفەکان و لە بەینی مەعنادا**

**کامیانە:**

**ناوێك پڕاوپڕی شەوە**

**یاشەو پڕاوپڕی ناوێك؟**

# گێچەڵێك لەگەڵ خۆمدا

ئێوارە گوڵی مۆری وردی دەكردەبەرگی كتێبێك،
باڵندەی خورمایی بن باڵ زەرد
لاپەڕەكانیان هەڵدەدایەوە
لەیەكەمین لاپەڕەدا :
پاڵەوانێك
بەسەرپشتی بارگیرێكی لەڕو بێكەڵكەوەیە
كۆشكێكی قاوەیی كەوتۆتە لاشانی گردێك و
چراكانی داگیرساون

**کەدەتەوێ بچییە ژووری**

**ڕمەکان بۆت ڕاگیراون**

**مۆسیقا دەژەنرێ**

**تاریکی پێ بەپێ نزیك دەبێتەوە**

**کاهینێك**

**حیکمەتی ناو کتێب بەو گوڵە وردانەدەڵێ: های!**

**ئەو سەردەمە چ سەردەمێکە؛**

**وەرزێڕێ دەچێبەگژ چەقێندا**

**گەڕیدەیێ..**

**هەروەها دێوانەو**

**ئەنتیکەناس و گەوهەرڕێژ**

دەچن بەگڕ پەروانەی حەقیقەتێكدا
هەر سەردەمەو دۆن كیخۆتیێ
وەهمێك دەیكوژێ.
ئەوانە مەلی وردیلەی گەردن سپین
ئەمن گوێم لە دەنگیانە
لەناو وەردەكاندا دەجریوێنن.
بایەك دێ بایەك
هێلانە لە كونی دیواران تێكدەدا
موو بە سەری پیاوانەوە ناهێڵێ
هێلكە لە سكی ژناندا پیس دەكا
تۆزی سوور هەڵدەدا.

**کتێبێك**

**لەسەر مێزێکی فۆرمیکەی**

**باریك و درێژدا**

**شەڕ دەکا لەگەڵ شمشێرێك.**

**لەدۆسیەی کەنیسادا**

**پاڵەوانێك بەڕۆما پێدەکەنێ**

**ئەو دەڵێ:**

**ئازادی لە دەریا جێی نابێتەوە**

**من لە ژێر دار زەیتونێك دا**

**دەیشارمەوە!**

**ڕۆژێ ئەو کوپە دەردێنم**

مۆڵكی جیهانی پێ دەكڕم!
بەو شێوەیە
لە مەرقەدی حەللاجێكدا
چوارینەیەكی خەیام و
لە وەسیەتەكانی بوزا
مەولانایەك دەردەكەوێ.

لەلاپەڕەی دووەمدا :
باڵندە یەخەی جەنەڕاڵێك دەگرن
دوگمەی ئاڵتوونی سەر شانی
ڕادەپسكێنن

بالندەی بچوکی هەر هێندەی
وەنەوزی ئەستێرەیەك لەشەودا
جۆرە شەڕێك بەرپا دەكەن
لە ڕۆمانێكی كۆندێرا تەماشای
سۆرێكی حەرام و
پاشماوەی زەردێكی تێر دەكەن
بەسەر بۆنیتی ئۆتۆمبیلی پۆلیسی نهێنییەوە.
ئەو بالندە وردیلانە
شەرابێك لەبنی كوپەدا دەدۆزنەوە
ئەو شەرابە سۆر بۆتەوە لەمەراقی پیاڵەیەكدا.
لە كتێبێكدا، كە ئێوارە گوڵی مۆری/

كردۆته بەرگی
(ئەو كتێبە ناگۆڕمەوە بەكەشتی نوح، من وتم)
پاڵەوانێك بەپشت گا جووتی ناونیشانی وەهمێكەوەیە
زەوی نارنجی ناو تابلۆی/
رۆخ ئاوێك دەكێڵێ
ماسی خاڵ خاڵی كلك سۆر
لەناو ئاوەكە دیارن
ئەو گیانلەبەرە زرنگ و دەنگ خۆشانە !
شەڕی من و واهیمە خۆش دەكەن لەئاودا.
ماسیگرێك
بەسەرپشتی تەختەی شكاوی بەلەمێكەوە

چەند ساتێکی تر شەپۆل دەیخاتە بن خۆی و
دەیدا بە تاشە بەردێکدا.

لە کتێبێکدا؛
لە بەرگەوە بۆ بەرگی پڕە لەبۆنی پەرێز و
جوقە جوقی مەلی وردو
پەلکی گیا
لە دوا دێڕو دوا لاپەڕەو
دوا کتێبدا
گێچەڵێك دەمێنێتەوە
لەبنی کوپەدا

شەرابێك سوور دەچێتەوە.
بەو شێوەیە
هەر سەردەمەو
كتێبێك دەچێت بەگژ شمشێرێكدا.
ئەو كتێبە،
جارێكیان دۆن كیخۆتەو
جارێكی دی پەلكی گیا.

## جوانیەکـــــــان

**چاو درۆتان لەگەڵ ناکا: شارێك لە عاجی سپی‌یە**
**چنراوە بە دانەی یاقووت و بەردی چۆتە ناو خامۆشی**
**دیوارو دەرگای چۆتە ناو مت بوونی کلیل و پەنجەرەی**
**چۆتە پشت بێدەنگی پەردەوە.**
**یەکەم چرا کێ هەڵیکرد؟ یەکەم با**
**بەپشتی زستانێکی قەمبوورەوە**
**کێ هێنای؟**
**چاو درۆتان لەگەڵ ناکا: شارێك تەواوشین دەچێتەوە**

له چاوی ژنه‌كانیدا، ده‌ستم برد بۆ گوڵی شیلانی
چكۆڵه‌ی باخێكی؛ له‌و ساوه بۆنی ژنێكم لیّ دیّ
ژنێك كه پێشتر به ته‌نیا ده‌ژیا.
چاو درۆتان له‌گه‌ڵ ناكا
له‌ش پڕه له خێروجوانی. گه‌ڵایه‌ك به ده‌نگی باریك
بانگی كرد: لكه دارێك گرژ بۆته‌وه، باخ ته‌واو
شڵه‌ژاوه له ته‌ماشای میوه‌ی خۆیدا، به‌هه‌مان
شێوه ژنێك، له ئاوێنه‌وه ته‌ماشای خۆی ده‌كا.
پیاوێك قۆپچه‌ی كراسه‌كه‌ی بۆ داناخرێ
هه‌روه‌ها بۆنی ئه‌م به‌یانی‌یه
له به‌یانی‌یه‌كانی تر ناچێ.

**دەمم تەڕبووە بە تامێك، ئەو تامە لە کوپەی**

**خەونێکدا ببۆوە شەراب، ئەو شەرابە،**

**ژنێك بە گووانی هەورێکدا ناردبووی.**

**ژنە تەنیاکە نووسیبووی:**

**تۆ ئەو شەرابەی**

**لەشی من**

**دەخۆیتەوە و خەودەبینی**

**لەو خەوەدا: دەچێتە کڵێسایەك و من لەوێ**

**لە پەیکەرێکی مۆمدا، چارۆگەیێکی شینی تۆخم**

**بەسەرەوەیە، چاوەڕێی منداڵیت دەکەم**

**بیخەمە نووری خۆمەوە.**

بەو خەونانەوە من ماوم
جلەكانم بەو خەونانەوە.
بەو خەونانە باليف و دۆشەكم
پڕدەبن لە بۆنی خۆشتر لە شەراب.
هەرهێندەی چرايەكم بەسەر لقی درەختەكانتانەوە
تەماشا: هەر هێندەی سۆفيلكەيەك و
دەچرپێنم بە نەرمەی گوێچكەتان دا:
ئەو مەمكانە سيس بوون هێندەی
سەری پووچ بيانكەن بە سەرين.
چرای ماڵم كز كردووە هەر هێندەی دەستێكی بچووك
ژنە تەنياكە ئامۆژگاريم دەكا:

لەلای باخچەوە وەرە ژووریَ
با پێت بە ئاوی گیا تەڕبێ
لە بیرت نەچێ کە هاتی، جلەکان لەلای کوکوختی
ژێر هەیوان دانێ
لەسەری سەرەوە، من لە پەیکەرێکی مۆمدا
عەشقێکی کێوی ئالاوە لە لەشما
چرا خۆیم  لێبدا بە تیشکی ئاوس دەبم
لە بیرت نەچێ، دوو چاوی ڕەشی تۆخ ماوە
بۆ دیتن و چاو دروناکا،
من جوانم فرە جوانم
لە چاوەڕوانیتدا.

# هەوڵێك بۆ كوشتنی كات

## كات دوو باڵی كراوەیە لە شێوەی قەفەسێكدا

**هاژە هاژی چركەژمێر**
**ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆی**
**بەگوێ چەمێكدا**
**دەچووە خوارێ**
**كە دەگەیشتە سێبەری**
**ئەسپینداریكی ئەو چەمە**
**پەلكە بۆنخۆشەكان**

وەرزێكی تازە چاوەڕێ دەكا
هەیهات، كات هەمووی
بەسەر تەنافێكەوە
ئەویش شل شل بەسەر لافاوێكەوە
نیوەی سنگی هەورەكانی بەدەرەوەیە
نیوەی قۆڵی شەوەكانی ڕووتە
نیوەی پشتی هەوا لێیدەدا.

**تووکی نەرمیان**
**بە ئاستەم**
**بەرمل و لاڕوومەت و**
**جێی ترمان دەکەوت**
**پەلکە تەنکەکان**
**باوەشێنیان دەکردین**
**لەناو بەیانییەکی**
**شەرابیدا**
**دەلەرینەوە.**
**ئەو پەلکانە**
**کات هەڵدەخڵەتێنن**

وەرزێك تەنیا ماوەتەوە
سەرم دەخەمە ناو شەپۆلێکی
نازانم تەمەنی شەپۆل چۆن دەپێورێ،
من مەبەستمە سەرێکی لێرە و
سەری تری لە باخەڵی
ژنێکدا کات بکوژێ
بە تیری ژەهراوی.
دەڵێن کات لە ئاوێك دەچێ
شەپۆلی خۆی بخنکێنێ
یا لە دەستێك دەچێ
سێوی ناو لەپی بەتاڵکا

**كات دەگەوزێنن**
**لەناو کەسکێکی خاڵ**
**خاڵی پرتەقاڵیدا.**
**چرکە ژمێر لەلای ڕاست و**
**سەعاتژمێر**
**لەلای چەپم**
**دیقەتم دابەو دوو سەوڵە باریکانە**
**ناگەمە ئەوسەری ئاوەکە**
**بەتایبەتی**
**باران، سەری ئاو و بنی**
**ئاوی هێنابوە یەك**

ئاو لەکوێ و
دەست لەکوێ
سەرو سەلسقە و گەوهەری کات
کوشتن لە کوێ
نارەحەتی زەردی تۆخی نیوەڕۆیەکی
هاوین و
نائارامی مۆرووی سوور و
مردن لەکوێ؟
ڕۆژ دەپشکوێ
کە دەزانێ من بەرێوەم
نیوەم تاریك

**بۆ هەڵڕشتنی**
**سۆزێکی دەریایی.**
**من تەواو دڵنیا نەبووم**
**سروشت تاکوێ**
**لەگەڵما دەبێ**
**تاکەی پشتم نادا**
**بە کێوی بەفرینی ئۆقیانوسێکدا.**
**دوانزە تیر و خاڵێکی**
**ڕەش و سێرەێیك**
**دوانزە چۆلەکەو چلێك و**
**پەنجەرەیەك**

ڕۆن بۆتەوە نیوەی ترم
نیوەم حەڵاڵ حەرام بووە
نیوەی ترم
تەماشا:بەریەك کەوتنی
ژیان و مردنم لە شێوەی
دورگەییێکدا درێژ بۆتەوە
تا خەیاڵ پێی خۆشە
هەر بەردە و پێ بەپێ دەچێتە
ناو ئاوەوە.
ئەو مەنتیقە هوزار نایزانێ
لە ئاستی گوڵدا

**دوانزە عەشق و کچێکی**
**پارچەلە**
**چۆن دەگونجێ**
**لە دوانزە ماڵی جیادا**
**من ماڵێك بکەم بە ماڵی**
**حەقیقی خۆم؟**
**دینگ دۆنگ**
**دۆنگ دینگ**
**لەم ماڵەوە بۆ ئەو ماڵ**
**ئەو کراسی بەفری دەکرێ**
**ئەو جانتای پڕ لە بروسکە**

هێشتا با فێری نەبووە
بۆ دیتنی دەریا
ئەگینا
گێژ ناخوا لە مەعنای گێژەڵووکەدا
شێتانە خۆی ناسووێ لە پەلك و
پەنجەرەو
جلوبەرگی هاتووچۆکەران.
بە چەپدا بڕوانی چاوێکی تۆخ
بەیانی دەپێوێ لە ڕۆخی ئاسماندا
دەنگێکی فەیروزەیی دەکەوێ
پۆڕی شیعرێك هەڵیدەگرێ

**ئەو گۆڕەوی خۆخی تووکن**
**ئەوی تر پێڵاوی**
**هەور و بەوشێوەیە**
**میلی بچوك**
**دەنووك لە ئاوی**
**گەورە وەردەداو**
**میلی درێژ**
**دەنکە پووشکەهەڵدەگرێ.**
**کە بەیانی دێ دەبینێ،**
**هێلانەیەك خۆی**
**هەڵخستوە بەدارەوە**

دەیباتە ناو پوش و پەڵاشی زمان و
قافیە دەیەوێ ونیکا لەناو
مەنتیق و بەلاغەدا
کێش بەهەمان شێوە بیشکێنێ
لەناو بڕگە و تەفعیلە و
پەنجەی پڕ ئەنگوستیلەدا
کەچی ئەزەل لەوسەری سەرەوە
بێباکانە ئەو قسانە دەڵێتەوە
کە قەلەڕەشێك وتبووی
لای ئەدگار ئالان پۆ:
ئەوەی ڕۆی ناگەڕێتەوە

**زەڕنەقووتەی حەزێكی نوێ**
**مل دەردێنێ لەناو چیلكەی**
**هەڵچنراودا.**
**بەیانی پیاوێكی شەهوانی و**
**ئیجگار خورتە**
**بەژنێك و دووان و**
**پەنجەرەیەك و**
**باخچەیەك ناسەكنێ**
**لانی كەم وا دەردەكەوێ**
**كاتێ بەو هەموو گزنگە**
**شەبەقییەوە دێ**

ئەوەی بزر بوو، بزر بو...
بەیانی بەسەر دیواری حەوشەوە
دێتەوە ناومان
دەنگی بلندی كۆنترباسێك دێ
چەند چەلۆیەك دوا دەكەون
بۆ ژەنینی وەرزێكی نوێ
دەستی‌سپی پڕبازن و
لەشی تەواو لە كافوور
خەونی مێخۆش مێخۆشی تەواو
بەجلی تەنكی شەوەوە دێنە دەرێ
گوڵەكان ڕێك دەخەن لەناو باخچەدا

**بەو هەموو ڕەنگەتاوسیو**
**ئەو لینجە نێرانەی**
**لێی دەرژێ.**
**فرزەندەکانیشی کەوتوون**
**بە دیارییەوە**
**بەیانی باوکی ناشەرعی**
**هەموو کاتەکانە**
**بەهەمان شێوە و بۆ هەمانمەبەست**
**باوکی ناشەرعی**
**هەموو باڵندەکانە.**
**دینگ دینگ**

**تا زەریف گوێیان لە دەنگی**
**چیا نشین و کەودەنیان نەبێ**
**کە بەهات و هاوار دەگەنە ناوشار.**
**گوێم لەدەنگی تەقە تەقی**
**عەرەبانەی خۆر گرتووە**
**لە دووڕیانی نیوە شەوو**
**نیوە هەور و نیوە بارانەوە دێ**
**تائەو وەختەی دەنگێك**
**دەنگێکی تەواو نەبیسراو**
**لەبن سواندووی ئەرخەوانیدا**
**دەخەوێو**

**دۆنگدۆنگ**
**لەوەسفی کات و خوێندنەوەی**
**هێڵەکانی ناو لەپیدا**
**سیحرێك دەمار دەمار دەکشێ**
**لە سادەیی گەڵایەکدا**
**بۆنی ماستێکی سوتاو دێ**
**دیارە دەماری زەوی جوڵاوە؛**
**ئەو بۆنە حەزێکی کۆنە**
**لە جێی خۆی دەجوڵێنێ**
**ئەو کاتەی بەسەر پشتی**
**گردێکەوە**

چەشنی چلوورەی ڕووناکی
بە سولاوکەی بەیانیدا دێتە خوارێ
دەنگی ئاو چۆنە لەناو دەماری
گەلادا
یا دەنگی با کە دەخرێـە ناو
کوندەێکەوە
هەڵدەگیرێ بۆ وەرزێکی درەنگترو
هەژانێکی بەگوڕتر
ئەو دەنگە وا خۆی دەنوێنێ
لە لای منـدا.
ڕۆژگارم لە کردنەوەی قۆزاخەی

**تەماشای دەشتێکی ڕووتم**
**دەکرد:**
**ئەولای دەکەمە باخ**
**ئەملای دەدەمە دەم چۆمو**
**قامیشەڵان بۆ باو ئەشقیاو**
**ئاژەڵی کێوی.**
**هێندە باسی کاتی سپی و**
**کاتی ڕەش و**
**کاتی هەور و**
**سیحری پەمەیی کاتم کرد**
**لەتێکی سروشت دەوریدام**

ئومێدێکەوە دەست پێدەکا
تا کەوتنە خوارەوەی کات و
دەرکەوتنی نائومێدی تەواو
لەکۆلانی هەورێکی
چڵکندا.
ماوەییێك دەمویست
کات بە حەبێکی کەبسول بکوژم
ئەو حەبە پیری کردبوو بە گۆچانێك
بۆ ڕۆیشتن بەسەر ئاوی منداڵیدا
یا خەوی دزیبوو لە چاوی زریاییێك‌و
کردبووی بە چاوی مندا

## هەوڵێك بۆ كوشتنی كات

**لە شێوەی سەعاتێكدا**
**چركە ژمێر بەدەوری داری**
**سێوێكدا دەخولێتەوە**
**سەعاتژمێر دوای دەكەوێ**
**بۆ باخەڵی حەرامێكی**
**لاسوری گەیوو كە لە شاخێكدا**
**كەڵە كێوییەك خۆی لـێ دابێ و**
**هەڵیدابێتە خوارەوە**
**ئەویش خۆی بەچڵی**
**كاتێك گرتبێتەوە**
**هەر جارە و بەشێكی**

یا پێكێك لە عەشقی
ڕابردووی هێنابوو
خستبویەسەرلێوی شەوێكی داهاتوو
ئەو شەوە نەدەچووە ناو ڕۆژگارەوە
لەو ناوە تەریبوو بە دەستی
یاخی بونێكەوە
ئەو حەبە كاتی دەكوشتم
لەبێكاتی قەفەسێكی شكاودا
كە لەشێوەی باڵێكی كراوە
خۆی دەنواند
لەسەر تخوبی خوێنێكی ڕژاودا

**ئەومێوە گەییوە**
**مردن دەکوژێ بەتامی‌سێوێکی**
**تەماشا: ئەو سێوەی**
**لەم شیعرە شینەدا**
**کات دەکوژرێ**
**دوو چاوی ڕەشێتی.**

دڵۆپە خوێنێك دەبریسکێتەوە
من بەدیار ئەو ڕەنگە سوورەوە
وەستاوم
داوای حەقێکی کۆن دەکەم
ئەوخوێنە نەڕوا من ناڕۆم
کات بەوخوێنەوە دەکوژم.

## فەلسەفەی پووچی

بەلەمێك بە سەرپشتی ئاوێکەوە
شەڕدەکا لەگەڵ شەپۆلی
ماسیگرێك لێی دەخورێ و
هەزارویەك خەونی ورد و
خەونی گەورەی
دەنووك زل و
دەنووك باریك
بنباڵ سپی
سەرباڵ تاریك

**لەسەر ئاوێ دێن و دەچن**

**مل دەدەن لە هەور و پاشان**

**لەسەر ڕۆخی بەلەمەکە دەنیشنەوە.**

**ماسیگر قولاب دەهاوێ**

**ئەو پەتە لە هەوداو**

**حەسرەت و**

**ئاهووە لە ناسیکیدا**

**لە بن ئاوێ عەینی مارە  دەفیشکێنێ**

**یەکەم نێچیر کە دەیگرێ**

**قورس دادێ دەستی ڕاوچی و**

**ڕەوتی گەمیە و**

**خەونی فڕیوو.**
**ماسیگرێك**
**بە سەرپەرشتی بەلەمێكی گرانەوە**
**خاوخاو دەڕۆن بە دەوریدا**
**هەزار و یەك ماسی گەورە و**
**ماسی بچووك**
**یاری دەكەن لەگەڵ شەپۆل**
**نە فیشكەی قولاب قوڕگیان دەگرێ**
**نە ماسیگر سەرنج دەدا لە دیمەنیان.**
**ماسیگرێك.. جوانی هەموو ماسییەكانی**
**بە پەپوولەكەی ماسییەكی گیراو نەدا**

**هەزار چۆلەکەی سەرداری**
**بەو مەنتیقەی، ناکەن یەک چۆلەکەی ناودەست**
**نەشئەی هەموو ماسیەکان لە فڕیندا**
**ناکەن بریقەی ماسیەک لەناو تۆڕدا!**
**ماسیگرێک..**
**بەسەر پشتی خەوێکی کوژراوەوە**
**شانی داوەتە ڕۆخی بەلەم و**
**ماسییەکی گەورە هێندەی خەونی شاخێک**
**بە پشتیەوە،**
**تیشکی هەتاوی لێدەدا**
**دەڵێی شارێکە دەبریسکێتەوە.**

چی بكا ماسیگر چی بكا؟
هەمیشە خەونێك،
بە تەنیا خەونێك تا بەیانی دەمێنێتەوە،
لەناو هەزاران خەونی جودادا.
ئەوكاتەی مەلێك دەپێكرێ
دەیان مەلی دەوری دەفڕن بە حەوادا
ژیان هەمیشە ڕۆخێكی دیارە و
ئەوی تر بزرە لەناو عەدەمدا.
ماسیگر چی بكا؟
چارەنووس خەونی پووچ دەدا بە گوێچكەی
مێروولە و

ماسی بچووك و
مرۆی بەستەزمان.
خەونی نان تەواو جیاوازە لە خەونی ئاگر و
خەونی نەهەنگ و
هەڵۆ و
سوپەرمان تەواو جیاوازن
ماسیگر چی بکا؟
خەونی ئەو چۆتە بن پێستی ماسییەك ،
ڕایدەکێشێ بە دوای خۆیدا
لەو بەینەداشتێك نەماوە بۆ موغامەرە
شەڕ لەگەڵ چی بکا ماسیگر؟

## لە شەوێكدا

لە شەوێكدا
قان قان باخچەی زووقم گرتوو
سەریان خستۆتە كۆشی ڕووبار و
كپ بووە كۆڵانی خەرخەشەو
جەستەی مەل و عاشقانی،
پەنجەرەیەك لە پشت پەردەوە
دیمەنێك دەشارێتەوە
ژنێك كە پێشتر بە تەنیا دەژیا

لە ژوورێکی چۆڵدا خۆی کوشت
بەیانی پەلکێك سۆراخی
شەونمی ئەندێشەی شەوانی
خۆی دەکرد لە باخچەیەکدا
دەشت و دەر پرسیاری بۆنی
غەریبێکیان دەکرد
لەش پرسیاری بەفرێکی دەکرد لە ڕۆحی
ئەوکاتەی داپۆشێ و
لە ژێریی تامێکی خۆش بگرێ
وەك هێشووی ترێیەك پرسیاری
لە کەلی زستاندا گیر بووبێ

ڕەز تەواو شڵەژا بەو چەشنە
لە تەماشای بەری خۆیدا،
ئەو ژنە لە سرووشت دەچوو
لە گۆڕینی وەرزەکاندا و
لە شەوێکدا
وەکو تاریکی نەرم و لووس
بۆ لای سپێدە کشا لەسەرخۆ
ژنێك بەو هەموو قەناعەتەوە
پەرداخی پڕکرد لە ژەهری گوڵی زەرد
نەبادا مەست بێ بە سۆری تاریکی
شەوەکانی.

**لە شەوێکدا**

**دڵم لێدەدا بۆ ژنێك**

**ئەو شەرابە بە یادی ئەو دەخۆمەوە**

**بە یادی ئەو**

**لەسەر دۆشەکی سیرە دەخەوم**

**دوا سەرنجم دەبڕمە کونی دەرگاکە و**

**ئێستاکە نا ئێستاکە دێ،**

**ئەم شەممەیە شتێك ڕوودەدا**

**هەسارەیەك لە مەداری خۆی دەردەچێ**

**گوڵێك بۆنی بزر دەکا**

**چاو ئەو دیووی بینینی خۆی**

**باڵ ئەو سەری فڕینی**

**هەموو شتێك دیوێکی خۆی بزر دەكا**

**شەو ڕۆژێکی**

**پشت پێشەوەی**

**پەلك بەری لای دەماری**

**دەست ناولەپی**

**هەموو شتێك هەموو شتێك..**

**ئەم شەممەیە شتێك ڕوودەدا**

**كەس دەسكاری سپێدەی ئەو ڕۆژە نەكا**

**كەس نارنجی ئێوارەی نەگووشێ**

**كەس شەوی نەباتە سەرجێگا**

**لە شەوێکدا**

**بۆنی ژنێکی تەنیا پەرت دەبێ**

**لە دەشت و دەر و ناو شاخەکاندا**

**من دامێنی ئەو بۆنە دەگرم**

**لە بیرم نەچێ،**

**ئەم شەممەیە شتێك ڕوودەدا**

**ژنێك..**

**قۆپچەکانی کراسی شەو دەکاتەوە**

**بەدیاردەکەون ئەستێرە و،**

**لەوپەڕی ساردیدا دەبریسکێنەوە**

**لە شەوێکدا**

**پەنجەرەیەك تا بەرەبەیان دەسووتێ**

**ژنێك، لە ژوورێكی چۆڵدا**

**دێتە دەرێ و لەگەڵ بایەكی سارد، ئێجگار ساردا**

**تێكەڵی بێدەنگی كۆڵان و**

**خەوی دارتووەكان دەبێ‌ژ**

**لە شەوێكدا**

**كە كەس بە دەرەوە نییە**

**ژنێك كە پێشتر بە تەنیا دەژیا**

**مردن دەكا بە كەسی خۆی و**

# گەلاکانی سەر شۆستە

لە دیوانی "شەوی دووەم"دا هەندێ هەناسەی شیعریم بلاوکردبووەوە لەژێر هەمان ناونیشـاندا، کە بریتین لە سکێچی ڕۆژانەو هەندێ وردە سێبەرن بۆ جوانییـــەکی خـێرا و ئـەو چـەند گەلایـەش دەچنە پاڵ هەمان ئەزموونی شیعرییەوە و ئەنجام هەر هەموویان چلێکــی شـیعرین لـە درەختێکــی بچکۆلانەمدا.

## شەرم

هەنارێك خۆی شاردۆتەوە
لە پەنا ئەستێرەکاندا

سۆربۆتەوە هەردوو كوڵمی
لەژێر پەنجەی گەڵاكانی.

## مەراق

خۆرێكی مۆر
چۆتە بنمیچی خەیاڵ و
هەرچی دەكەم نایێتە خوارێ
خودایە! دڵی ئەو خۆرە نەرمكە
ئەو لەوێ بمێنێ
خەو ناچێتە چاوانمەوە.

## بێلانە

**تیشکی هەتاو بێزار نابێ**

**لەو شەقامەوە بۆ ئەوی تریان**

**لەو بانەوە بۆ ئەوی دی**

**لەسێبەری ئەو دارەوە بۆ سێبەری دارێکی تر**

**مەراق چۆتە ناو سوڕی خوێنیەوە**

**تا ئێوارە، بەو شێوەیە**

**سەردەکا بە هەموو شوێنێکدا.**

**هەتاو لە هەتیوێك دەچێ**

**ماڵی نەبێ**

**هەر شەوە لە شوێنێك بنوێ.**

## درەوشانەوە

**هەر حوكمە و**

**ئەنگوستیلەیەك دەیسوڕێنێ**

**من گوڵی مێخەكی سوورم**

**خستۆتە نێوان پەنجەكانمەوە.**

**هەر حوكمە و**

**كورسییەك دەیگێڕێ**

**من لەسەر فەرشی گیا دانیشتووم**

حوكمی ئەستێرەیەك دەكەم
لەوسەری دنیادا.

## سەرەتا و كۆتایی

بۆ شتێك دەگەڕێم نەژمێردرێ
هەرچی هەیە لە پەنجەی پێ تا تەوقی سەر
لە ئەرزەوە هەتا ئاسمان
هەر هەمووی دەژمێردرێ.
تەنیا شتێك كە نەژمێردرێ
ئەو شتەیە
كە جارێك دێ و نابێ بە دووان.